چاپی سێ هەم



# أعلام السنة المنشورة

## لاعتقاد الطائفة الناجية المنصورة

## بەکوردی

٢٢٣
پرسیار و وەڵام لەبیرو باوەڕی ئیسلامی

زانای پایەبەرز
حافظ بن أحمد الحكمي



وەرگێرانی
ئارام قادر

# ( الإعلام السنه المنشوره )

# بەکوردی

# ٢٢٣ پرسیارو وەڵام دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلامی

نووسینی : شیخ الحافظ الحكمي

وەرگێڕانی : ئارام قادر

بسم الله الرحمن الرحيم


**ناوی کتێب**

(الإعلام السنة المنشورة ) بە کوردی

٢٢٣ پرسیار و وەلام دەربارەی بیروباوەڕی ئیسلامی

**ناوی نوسەر**

شیخ الحافظ الحکمي

**ناوی وەرگێر**

ئارام قادر

**تیراژ**

١٠٠٠ دانە

**ژمارەی سپاردن لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکان**

(١٠٠)

**سالی چاپ و نۆرەی چاپ**

چاپی سێیەم سالی ٢٠١٣

چاپ و تەجلیدی ڕێ نوێ دیزاینی کردووە

# پێشەکی

## تەنها بە ناوی خوا

بڕوابوون بە بنەماکانی ئیمان و پابەندبوون بە ڕوکنەکانی ئیسلامەوە فەرمانی خوایە بۆ گشت پێغەمبەران و سەرجەم شوێنکەوتوانیان بە تایبەتی ئێمەی موسڵمانی ئوممەتی پێغەمبەری ئیسلام (محمد المصطفى ﷺ).

گەلانی سەرزەوی ئەوەندەی پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و ئاو و هەواو باو باران و مانگ و خۆر و پێویستیەکانیتری ژیان هەیە ، لەوانە زیاتر پێویستی بە ئاین و بیروباوەڕی ئایینی هەیە ، هەروەك زانا و خواناسان بە ڕوونیو بە ڕاشکاوی باسیان لێوە کردووە.

چونکە مرۆڤەکان ئەگەر بتوانن بە چەند ژەمێك خواردن و خواردنەوە شەو و ڕۆژ بەسەر بەرن ، بۆ هەموو ساتەوەختەکانی ژیانیان پێویستیان بە ئاین هەیە و هەرگیز ناتوانن تەنها بۆ ساتێکیش بێت دەسبەرداری ئیمانەکەیان بن.

هەروەها مرۆڤ بە لەدەستدانی هەریەك لە پێداویستیەکانی ژیانی ئەوا ژیانی دنیایی لە دەست دەچێت لە کاتێکدا بە لەدەستدانی ئایینەکەی لەگەڵ ئەوەی ژیانی دنیای پڕ دەردەسەری دەبێت لە هەمان کاتدا ژیانی پاشەڕۆژی لە قیامەتدا بۆ هەتا هەتایی لە دەست دەچێت و سزای نەبڕاوەی دۆزەخی دێتەڕێ.

﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾

طه : ١٢٤) واتە (وەهەرکەس پشت لەزیکری من بکات ئەوە ژیانی لێ تەنگەلان دەکەین وە لەقیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین)

جگە لەوەی دەسکەوتی دونیایی و نیعمەتی ژیان کاتییە و پاداشتی خوایی و نیعمەتی پاشەرۆژی بەردەوام و نەبڕاوەیە ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (النحل: ٩٦) واتە: ئەوەی لای ئێوەیە تیا دەچێت ونامێنێ تەنها ئەوە دومێنێتەوە کەلای خوایە)

ئەوەی کە ژیانی هەمیشەیی پێ دەست دێت تەنها دەستگرتنە بە ڕێبازی پێغەمبەران و جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورە و ڕێنمایی پێغەمبەران.

خوای گەورەش فەرموویەتی ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ (ال عمران: ٨٥) هەرکەس و نەتەوەیەك بێجگە لە ئیسلام بکاتە بەرنامەی ڕێبازی خۆی ئەوە دەدرێتەوە بەسەریدا و پاشەڕۆژیش لە زەرەرمەندان دەبێت.

﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا ﴾ (الأنعام: ١٥٣) خوای گەورە تەنها ئەم ئایینە قورئانیەی بە ڕێبازی ڕاستەقینە دیاری کردووە.

بێگومان ئیمان و باوەڕیش خاڵی هەرە سەرەکی ئەم شەریعەتەیە بۆیە ئەگەر سەرنجی باسی ئیمان بدەین ئەوا لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئیمان و باوەڕ لە هەندێ شوێندا لە بری هەموو شەریعەت ناوبراوە وەك لە فەرموودەیەك دا هاتووە کە (الأيمان بضع و سبعون شعبة) و في رواية (بضع و ستون شعبة) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە واتە ئیمان حەفتاو هەندێ بەشە.لەگێڕانەوەیکدا هاتووە (شەست و هەندێ بەشە)..

لەبەرئەوە ئاشنابوون بە ئەرکانی ئیمان و بنەماکانی ئەو شەریعەتە ئەرکی سەر شانی هەموو موسڵمانێکە بە بێ جیاوازی تا وەك فەرموودەی خوا لە دڵ و دەروون و

کردار و گوفتارمان دا بەجێبهێنرێت کە دەفەرموێ : ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الزاريات: ٥٦) هەر بۆیە ئەم لایەنە گرنگە ڕۆڵی کاریگەریی بینیوە و دەبینێت لە درێژایی مێژوو و لە داهاتووشدا .هەرکات و سەردەمێك ئوممەتی ئیسلامی هەڵگری پەیامی خوایی بووبن بەو شێوەیەی خوای گەورە داوای کردووە ئەوا سەرکەوتوون و زاڵ بوون بەسەر دوژمنانیاندا و بەختەوەری یاوەریان بووە ، بە پێچەوانەشەوە هەر کاتێك پشتیان لە ئایینەکەیان هەڵکردووە و ڕویان لە دونیا و دونیاویستی کردووە ، ئەوا زەلیلی و ژێر دەستەیی و کزی و لاوازی بەشیان بووە ، وەك لەم ڕۆژگارەدا بە چاوی خۆمان دەیبینین .

بۆیە پێویستە بە تایبەتی پاش ئەم گۆڕانکارییە سەرسوڕهێنەر و یەك لە دوایەکانە ، ئیمانداران جارێکیتر خۆیان لەو گرفتار بوونە دەرباز بکەن و سەرلەنوێ تەفسیرێکی واقیعیانە بۆ ئایەتی ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾ (ال عمران : ١١٠) بکەن و میراتی گەورەی پێغەمبەران و هاوەڵان و پیاوچاکان بە گرنگ بگرن و لەو پێناوەدا خۆیان ماندوو بکەن ..

سوپاس بۆ خوا ڕابوونی ئیسلامی لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتی و گیروگرفتانەی بەسەری هاتووە و دوچاری بووە جێگەی ئومێدە و چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێت کە بتوانێت زاڵ بێت بەسەر هەموو ئەو گرفتانەدا و کەلێنەکان پڕ بکاتەوە و لەسەر ڕێبازی قورئان و سوننەت پەرە بدات بە بانگەواز و ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ستەملێکراو و بەش مەینەتە بە عەقیدە و بیروباوەڕی ڕاستەقینەی خوایی رام بکات لەسەر دەستی مامۆستایان و بانگخوازاندا بەختەوەری دونیا و قیامەت بۆ خۆیان و گەلەکەیان دەستەبەر بکەن.

**ئازیزان:**

نووسرای ( إعلام السنة النشورة ) لـه نووسـینی (حـافظی حکمـی) یـەو بـەڕێز کـاك ( ئارام قادر ) کردوویەتی بە کوردی بە ڕاستی یەکێکە لەو پەڕاوە زۆر بەسوودانەی کە لە هەموو بابەتەکانی ئیمان و ئیسلام دواوە و بەڵگە و زانیاری بەهێزی تۆمار کردووە لەو بارەیەوە.

بۆیە بە باشمزانی پاش پێداچوونەوەی ئەم وەرگێڕانە ، دەست خۆشی لە برای بەڕێز کاك ئارام قادر و نزای خێر بـۆ سـەرجەم خزمـەتکارانی بانگـەوازیی ئیـسلامی بکـەم، سەرنجی ئێوەی بەڕێز ڕابکێشم بۆ ئەو چەند تێبینی و سەرنجانەی سەرەوە ، خـوای گەورە لە گشت لایەکی قەبوڵ بفەرموێت و یارمەتی گشت لایەکمان بدات بـۆ خزمـەت کردن بەم پەیامە.

(أن أريد ألا الأصلاح ما استطعت)

**عوسمان ئەحمەد مستەفا**

**پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) لە سلێمانی.**

**١٧ی ذوالحجة ی ١٤٢٢ کۆچی**

**١/ ٣/ ٢٠٠٢ زایینی**

## پێشەکی وەرگێڕ

### بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری جیهانیان و هەزاران سەلام و رەحمەت لە سەر گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری خوا محمد (ﷺ)و ئەوانەی شوێن رێبازەکەی کەوتوون .

بەڵگە نەویستە بناغە و بنچینەی ئاینی ئیسلام بریتییە لە عەقیدەی پاك و راست و دروست ، هەرکات عەقیدەی خەڵك بەراست و دروستی لە دڵدا گەشەی کردوو لەسەر زانست لە ژیاندا کاری لەسەر کرا ئەوا کامەرانی لە دونیاداو سەرکەوتن لە قیامەتدا سیمایی ئەو میللەتەیە . شاراوە نییە کە ئەو نەهامەتی و کێشەو ئازارانەی هاتووە بەسەر میللەتان و کۆمەڵە ئیسلامییەکاندا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی یان لادان یان تێکەڵ کردنێك لە عەقیدەی ئیسلامیدا .

هەر چەندە لە کتێبخانەی کوردیدا سوپاس بۆ خوا هەندێك بابەت لەسەر عەقیدە نوسراوە . بەڵام پاش پشت بەستن بە خوای تاك و تەنها و لەسەر پێشنیازی چەند برایەك داوایان لێ کردم کە نوسراوی ( اعلام السنة المنشورة لإعتقاد الطائفة الناجية المنصورة ) بکەم بەکوردی و بیخەمە بەردەست خوێنەرانی ئازیزی کوردزومان ، منیش پێشنارەکەیانم بە چاك زانی و دەستم کرد بە وەرگێڕانی ئەم نوسراوە بە کەمێك دەستکارییەوە و لەژێر ناوی (پوختەی عەقیدەی ئیسلام) ، بە مەبەستی زیاتر دەوڵەمەندکردنی کاروانی کاری ئیسلامی لە کوردستاندا تا زیاتر گرنگی و بایەخ بە عەقیدەی رۆڵەکانی بدرێت و چاکتر گۆش بکرێن لە سەر عەقیدەی ئیسلامی، ئەو کاتە کاروانەکەمان بە پێزتر و بەهێزترو بەگوڕتر دەبێت ، پاشان ئەم نوسراوە وەك بەرنامەیەك دەتوانرێت بەکار بهێنرێت بۆ وانە گشتی و تایبەتیەکان چونکە عەقیدەی

ئیسلامی لە (٢٢٣) پرسیاردا کۆکردۆتەوە کە ئەمەش شێوازێکی ئاسان و هۆکارێکی چاکە بۆ زیاتر تێگەیشتن لە عەقیدەی ئیسلامی ، کە پێویستە ئەمڕۆ ڕۆڵەکانی ڕابوونی ئیسلامی خەریك نەکەین بە بواری فەلسەفەو کێشمەکێشمی جیاوازی نێوان زانایان ، بەڵکو عەقیدەی ئیسلامی ڕاستەوخۆ لە قورئان و سونەتەوە وەربگرن ، ئەم نوسراوەش زۆرتر بەڵگەکانی لە قورئان و سونەتەوە وەرگرتووە و نوسراوەکەشم کەمێك دەستکاری کردووە بۆ ئەوەی زیاتر ئاسان کاری تێدا بێت بۆ خوێنەران و ئەوانەی بەکاری دەهێنن بۆ وانەوتنەوە ، لەوانەش :- لابردنی پەراوێزەکانی کە پێویست ناکات بۆ قوتابیانی عەودالْ بە شوێن زانستدا .

لابردنی فەرموودە لاوازەکان و هێشتنەوەی فەرموودە صەحیحەکان .

تەفسیر کردنی ئایەتەکان و ڕاڤەکردنی فەرمودەکان .

تەحقیق کردنی فەرموودەکان لەسەرچاوەکانی خۆیانەوە ڕاستەوخۆ تا دڵنیابین لەوەی کە فەرموودەکان لەوێ وەرگیراوە . هەر لەبەر ئەوەش دەبینین هەندێك فەرموودە دەقەکەی کەمێك جیاوازی هەیە لەگەڵ سەرچاوە عەرەبیەکەدا ئەویش لەبەر ئەوەیە چۆن لە کتێبەکانی فەرموودەدا هاتووە وامان خستووەتە ڕوو نەك وەك ئەوەی کە لەسەرچاوە عەرەبیەکەدا هاتووە .

تەحقیق کردنی فەرموودەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ سەرچاوە بنەڕەتییەکەی و کێ ئەو دەقەی ڕوایەت کردووە ئەوەمان دەستنیشان کردووە گەر زانایەکیتر ئەو فەرموودەیەی بەدەقێکی جیاواز گێڕابێتەوە جیامان کردۆتەوەو یەك فەرموودەیانمان هەڵبژاردووە لەگەڵ ناوهێنانی ئەو زانایانەی ڕیوایەتی کردووە .

کەمکردنەوەی ئایەتەکان چونکە لەیەك بابەتدا یەك دەق بەسە بۆ بەڵگە و گومانیش نییە کە قورئان پانتایەکی زۆری تەرخانکراوە بۆ بواری عەقیدە ئەگەر دەقە

قورئانیەکان بمانەوێت هەمووی بە نمونە بهێنینەوە و تەفسیری بکەین ئەو کاتە نوسراوەکەمان دەبێت بە تەفسیر و لەمەبەستی تایبەتی خۆی دەردەچێت .

لەکۆتاییدا هیواخوازم کە ڕۆڵەکانی ئەم کاروانە و قوتابیانی قورئان زیاتر و زۆرتر بایەخ بدەن بە فێربوون و خوێندنەوەی عەقیدەی ئیسلامی لەسەرچاوە بڕوا پێکراوەکاندا و پانتایەکی شیاوی پێببەخشن لەکاری ئیسلامیدا و بیکەنە مەشخەڵی کاریان و زۆر بە گرنگی و بایەخەوە ڕۆڵەکانی میللەتی لەسەر گۆش بکەن و پەروەردەیان بکەن لەسەر عەقیدەیەکی پاك و دروست و وەرگیراو لە قورئان و سوننەتەوە تا کامەرانی و بەختەوەری بگەڕێتەوە بۆ میللەتی کورد و لەنەهامەتی ڕزگار بکرێت ، بە هیوای سودمەند بوون و فێر بوون و جێ بەجێ کردن .

﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ لقمان: ٢٢ .

واتە : ( ئەوەی نیەتی پاکە لە کارەکانیدا و مل کەچە بۆ فەرمانی خواو شوێن شەریعەت و بەرنامەکەی دەکەوێت ئەمە چاکە خوازەو هەر کەس بەو شێوەیە بێت پەیمانێکی توندی لە خوا وەرگرتووە ((کە سزای نەدات لە قیامەتدا ))

هەڵە بجە

٢٠٠١/٣/٢٢

**پ١: یەکەم ئەرك چی یە لەسەر (العباد) بەندەکان ؟ یەکەم ئەرکی بەندە چیە ؟**

و: یەکـەم ئـەرك لەسـەر بەنـدەکان بریتیـە لـە (زانـین بـوون) ، (زانـینی بـوون لـە) مەبەسـتی بـەدیهێنانیان لـە لایـەن خـوای گـەورەو وەرگرتنـی پـەیمان لێیـان ، وەپێغەمبـەرانی ( علـیهم الـصلاة والـسلام ) بـۆ چ مەبەسـتێك نـاردووە ، وە بـۆ چ مەبەستێك کتێبە ئاسمانیەکانی ناردووەتە خـوارەوە ، مەبەسـت لـە دروسـت کردنـی دنیا و قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ چیە ، بەپێی ڕێژەی ئەو (زانینە) و پابەنـد بـوون پێوەی تەرازووەکان دادەنرێن و نامـەی کردەوەکـان دابـەش دەکرێت و لەسـەر ئـەو بنـچینەیەش خـەڵکی جیادەکرێنـەوە بـۆ ئـەهلی دۆزەخ و بەهەشـت و لەسـەر ئـەو بنەمایـەش خـوا ڕونـاکی دابـەش دەکـات ﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ (النور:٤٠) . واتە: ( بێگومان ئەو کەسەی خوا ڕێنمایی نەکات و نووری پێنەبەخشێت سەرلێشێواوەو هەرگیز نووری دەست ناکەوێت ) .

**پ٢: مەبەست لەم بەدیهێنانی بەدیهێنراوەکان چیە ؟**

و: خوای گـەورە دەفـەرموێت ﴿مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الدخان: ٣٩ واتە: ( ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەو شتانەی لەنێوانیاندایە بـەبێ هـودە دروسـتمان نـەکردووە ، بـەڵکو هـەمویمان لەسـەر بنـچینەی حـەق و ڕاسـتی دروسـت کـردووە ، بـەڵام زۆربـەی خـەڵکی لـەم ڕاسـتییە تێناگـەن ) ، وە هـەروەها دەفەرموێت : ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاریات: ٥٦ .

واتە : ( بێگومـان من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ پەرستن دروست کردووە نـەك لـە بەر ئەوەی پێویستم پێیان بێت ) ، کەواتە خوای گەورە دروست کراوەکانی لە پێنـاو

پەرستندا دروست کردووە بۆ ئەوەی دان بە پەرستنی خوادا بنێن ، ئارەزوومەند بن لەوەدا یان بە پێچەوانەوە .

**پ٣: مانای بەندە ( عبد ) چی یە ؟**

و: بەندە ، واتە ملکەچ بوون بۆ بەرزی و گەورەیی و دەسەڵاتی یەکێك ، و هیچ بەرەنگاریی و یاخی بوونێك نیشان نەدات بەرامبەری و بەتەواوەتی بچێتە ژێر رکێفییەوە بەو واتایە هەموو دروست کراوەکان لە جیهانەکانی سەرەوەو خوارەوەدا دەگرێتەوە لە عاقڵ و بێ عەقڵ ، لە تەڕوو وشك ، گیاندارو و بێ گیان ، دیارو نادیار موسڵمان و کافر ، چاك و خراپ .. هتد ، هەموو شتێك دروست کراوی خوای بە دەسەڵاتە ، لەژێر بار و دەسەڵاتی ئەودایە و لە نەخشەو کارێك بۆی دیاری کردووە دەرناچێت و سنورێکیش دەستنیشانکراوە کۆتایی بەبوونیان دێت لە ژیاندا و ، تا کاتی دیاری کراوی خۆیان هیچ کات لێ لانادەن ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾یس: ٣٨ واتە : ( خۆر بەردەوامە لە ڕۆشتنی تا ئەو کاتەی بۆی دیاری کراوە ئەوەش توانای زاتێکی بە دەسەڵات و زانایە بە هەموو جوڵە و هەڵسوکەوتێك ) .

**پ٤: پەرستن چی یە ؟**

و: پەرستن : ناوێکی گشتیە بۆ هەموو کارێك کە خوا خۆشی بوویێت و لێی ڕازی بێت لە کردارو گوفتاری دیار و نادیار ، و خۆ دوورگرتن لە هەر کارێك کە دژی ئەو حاڵەتە بێت یان لەگەڵیدا نەگونجێت، پێچەوانە و دژ بێت.

**پ٥: چ کاتێك کردەوە دەبێتە خوا پەرستی ؟**

**و:** لە کاتێکدا کردەوە دەبێتە خوا پەرستی کە دوو مەرجی تێدا بێتە دی ، ئەویش تەواوی خۆشەویستی و تەواوی ملکەچ بوون ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾البقرة: ١٦٥ ، واتە : ( ئەوانە ئیماندارن کە خوایان زۆر خۆش دەوێت (چونکە تەواو شارەزان بە گەورەیی و دەسەلاتی خوا و یەکتاپەرستن و شەریك بۆ خوا بڕیار نادەن و تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن و لە هەموو کارەکانیاندا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە )) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ﴾المؤمنون: ٥٧ .

واتە : (( ئەوانەی لەگەڵ چاکەکردندان و بڕوایان بە خوا هەیە و یەکتاپەرستن و ترسی پەروەردگاریان هەیە ، دەترسن خوایان لێ بڕەنجێت )) . وە خوای گەورە هەردوو سیفەتەکەی لە ئایەتێکدا کۆکردۆتەوە کە دەفەرموێت ﴿إِنَّهُمْ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ﴾الأنبياء: ٩٠

واتە : ( ئەوان پێشبڕکێیان دەکرد لە گوێ ڕایەڵی خواو خۆنزیککردنەوە لێی و لە هەمانکاتدا لێمان دەپاڕانەوە لەپێناو شادبوون بۆ ئەو خۆشیەی لە لامانە و لە ترسی ئەو سزایەی ئامادەمان کردووە (ئەوانە ملکەچی و ترسیان بۆ خوا نواندووە)

**پ٦: نیشانەی خۆشەویستی مرۆڤەکان بۆ خوا چی یە ؟**

**و:** نیشانەی ئەو خۆشەویستییە ئەوەیە کە هەر شتێك خوا خۆشی بووێت ئەمیش خۆشی بوێت ، و ڕقی لەو شتانە بێت کە خوا حەزی لێ ناکات ، و فەرزەکان جێ

بەجێ بکات ، و دوور کەوێتەوە لەو کارانەی خوا قەدەغەی کردوون ، و پشتگیری دۆستەکانی خوا بکات و دوژمنایەتی دوژمنانی خوا بکات ، هەروەها بەهێزترین پایەیان دەسگیرە ئیمان بریتیە لە خۆشویستن و ڕق لێبوون لەبەر خوا وەك لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە ( أوثق عرى الأيمان المولاة فى الله و المعاداة فى الله والحب فى الله والبغض فى الله ).[1]

واتە : ( توندترین گرێی ئیمان بریتییە لە پشتگیری و دۆستایەتی لەبەر خواو دوژمنایەتی لەبەر خوا ، خۆشەویستی لەبەر خواو ڕق لێبوون لەبەر خوا ) .

## پ٧ : مرۆڤەکان چۆن دەزانن خوا چی خۆش دەوێت و بەچی ڕازی دەبێت ؟

و: ئەو کارانەی خوا خۆشی دەوێت و لێی ڕازیە بە هۆی ناردنی پێغەمبەرانەوە ( عليهم الصلاة والسلام) ئەو کتێبانەی کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە دەست نیشان کراوە و زانراوە، کە تێیاندا فەرمان دەکات بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی خوا خۆشی دەوێت و لێ ی ڕازیە و نەکردنی ئەو کردەوانەی کە ڕقی لێ دەبێتەوە و حەزی لێ ناکات ، لەو ڕێگەیەشەوە بەلگە لەسەر مرۆڤەکان دروست بووەو بەئاگا هێنراونەتەوەو حیکمەتی خوای گەورەشیان لەو شتانەدا بۆ دەست نیشان کراوە ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾النساء: ١٦٥ .

واتە : ( خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردوون مژدەدەرن بۆ ئەو کەسانەی گوێڕایەلی خوا دەکەن ، ترسێنەر بن ، تا لە پاش ناردنی پێغەمبەران خەلکی بیانویان نەمێنێت و هەموو شتێکیان بۆ شی بکەنەوە بەرامبەر خوای پەروەردگار ) هەروەها خوای

---

[1] شیخ ئەلبانی ج٢: ل ٩٩٨.

گـــەورە دەفـــەرموێت ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾آل عیمران: ٣١ واتە : ( ئەی محمد بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێنی من بکەون و لـە فـەرمانی مـن دەرمەچـن ، ئـەو کاتـە خـواش ئێـوەی خۆش دەوێت و لە تاوان و هەڵەکانیشتان دەبورێت و خـوای میهرەبـان لێبـوردەو بـە بەزەییە ) .

## پ٨: مەرجەکانی خواپەرستن چەندن ؟

و: مەرجەکانی خواپەرستن سیانن :

**یەکـەم** : ڕاسـتی و سـوور بـوون و بەدەمـەوە چـوون بـۆ ئەنجامـدانی ئـەو کـارە کـە ئەوەش مەرجی بەدیهێنانیەتی

**دووەم** : نیەتپاکی ( إخلاص) .

**سێیەم** : لە سنوور دەرنەچوونی شەرعی خوا لەو کـارەدا کـە خـوا فـەرمانی داوە ، و تـەنها بـۆ ئەو بەرنامەیە ملکەچ بین . ئەو دوو مەرجەی کۆتایش مەرجی قبوڵ بوونی کارەکەیە .

## پ٩: ڕاستگۆیی لە بەدەمەوە چوونی کاردا چی یە ؟

و: بریتی یە لەوازهێنان لەتەمەڵی و کەمتەرخەمی ، سەرفکردنی توانا بۆ یەکخستنی کردار و گوفتار ، خـوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ٣﴾ الصف : ٢-٣

واتە ( ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە چۆن دەبـێ چاکە بـەدەم بڵێن و بـە کـردەوە نەیکەن و ئەنجامی نەدەن! چۆن دەبێ گوفتارتـان دژی کردارتـان بێـت! گونـاهێکی گەورەو جێگەی توڕەییە لای خوا ، گەر شتێك بڵێن و جۆرێکیتر ڕەفتار بکەن ) .

**پ١٠: ماناى نيەتپاكى چى يە ؟**

**و:** نيەتپاكى بريتييە لەوەى كە مەبەستى مرۆڤ لە هەموو گوفتار و كردارێكدا ديار يان ناديار تەنها خواى پەروەردگار بێت ، وەك خواى ميهرەبان دەفەرموێت :﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ﴾ البينة: ٥.

واتە : ( فەرمانيان پێ نەدرابوو جگە بەوەى كە خوا پەرستى بكەن بە دڵسۆزى و نيەتپاكى و ملكەچ و پابەندى ئاينەكەى خوا) ، هەروەها خواى بەبەزەيى دەفەرموێت:

﴿لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ١٩ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٠﴾ الليل: ١٩-٢٠

واتە : ( وە نەبێت كەس پاداشت و ناز و نيعمەتێكى پێ بەخشيبێت تا پاداشتى بداتەوە يان لە پاداشتى چاكەى خەڵكيدا چاكە بكات ، بەڵكو هەموو كارێكى تەنها بۆ خودايە و مەبەستى بەدەستهێنانى ڕەزامەندى پەروەردگارى بەرز و بڵندە ) .

لە جێگايەكى ديكەدا خواى كاربەجێ دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا﴾ الأنسان: ٩ . واتە : ( بەس لەبەر خاترى خوا خواردنتان دەدەينێ چاوەڕوانى هيچ پاداشت و سوپاسێك لە ئێوە ناكەين ) .

كەواتە نيەتپاكى بريتى يە لە دڵسۆزى لە كاردا و بێباك بوون لە هەموو نيازێكى دنيايى و تەنها ڕووكردنە خوا لە كردار و گوفتاردا .

**پ١١: ئەوەیە بەرنامە خوا کامە کە داوای کردووە ئێمە پێوەی پابەندبین و لێی لانەدەین ؟**

**و:** بریتییە لە دین و ڕێبازی پێغەمبەر (إبراهیم) (سەلامی خوای لێ بێت) ،خوای میهرەبان دەفەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩ .

واتە : ( بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئیسلامە) و هیچ دینێکی تر لە کەس قەبوڵ ناکات جگە لەو شەریعەت و بەرنامەیەی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) گەیاندوویەتی ) ، هەروەها دەفەرموێت : ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا ﴾ آل عمران: ٨٣ واتە : ( ئایا ئەوانە جگە لە ئاینی خوا ئاینی تریان دەوێت ؟! لە کاتێکدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ملکەچی پەروەردگارە بە ڕەزامەندی بێت یان بە ناچاری ) . هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ﴾ البقرة: ١٣٠ ، واتە: ( کێ لە ئاین و ڕێبازی پێغەمبەر (إبراهیم) (سەلامی خوای لێ بێت) پشت هەڵدەکات جگە لەو کەسە نەبێت کە خۆی گێل و نەفام دەکات و ئەو کەسەش ستەمی لە خۆی کردووە کە لە ڕاستە شەقامی ئیسلام لادەدات ) ، و خوای بەخشندە فەرموویەتی :

﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ آل عمران: ٨٥ . واتە : ( ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت و لە قیامەتیشدا لە خەسارەت مەندوو زیانمەندانە ) .[1]

**پ١٢: پلەکانی ئاینی ئیسلام چەندن ؟**

و: پلەکانی ئاینی ئیسلام سیانن ، ( ئیسلام ، ئیمان ، ئیحسان ) هەریەك لەوانەی گەر بەتاك تاك باسكران مەبەست پێی هەموو ئاینی ئیسلامە.

**پ١٣: مانای ئیسلام چی یە ؟**

و: ( واتە تەسلیم بوون بە یەکتاپەرستی خوا و ملکەچ بوون بۆی بەگوێ ڕایەڵی و خۆ پاککردنەوە لە شەریك بڕیاران بۆ خوا ) ، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ ﴾ النساء: ١٢٥ . واتە : ( کێ هەیە ئاینی چاکتر و پەسەندتر بێت لەو کەسەی ڕووی کردۆتە خواو خۆی سپارد بێ بەخوا و نیەتی پاك بێت لە کردەوەکانیدا و بە پێی شەریعەتی خوا بجوڵێتەوە ) ، هەروەها دەفەرمویێت : ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾لقمان: ٢٢ . واتە : ( ئەوەی ڕوو بکاتە پەروەردگاری و نیەتی پاك بێت لە کارەکانیدا پابەند بێت بە شەریعەتی خوا ئەوە پەیمانی لە لایەن خواوە بۆ دراوە کە سزا نەدرێت ) هەروەها فەرموویەتی : ﴿فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ الحج: ٣٤ واتە : ( خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە هەمووتان تەسلیم و ملکەچی ئەوبن و مژدەش بدە بەو بەندانەی ملکەچ و ڕازین بە بڕیاری خوا ) .

**پ١٤: بەڵگەی چی یە لەسەر ئەوەی کە وشەی ئیسلام هەموو دین دەگرێتە ؟**

**و:** خـوای بـە دەسـەڵات دەفـەرموێت : ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ﴾ آل عمـران: ١٩ .
واتە : (بەڕاستی دین و ئایینی پەسەند لەلای خوا تەنها ئیسلامە) .
پێغەمبەریش (ﷺ) دەفـەرموێت : ( بـدأ الأسـلام غريبـا و سـيعود غريبـا كمـا بـدأ ) ئیمـامی موسـلیم ڕیوایـەتی کـردووە ، واتـە : ( ئیـسلام بـەنامۆیی دەسـتی پێکـرد ، جارێکی تر نامۆ دەبێتەوە هەر وەك چۆن لەسـەرەتاوە دەسـتی پێکـرد ) ، هـەروەها پێشەوامان (ﷺ) فەرموویەتی ( أفضل الاسلام الأيمان بالله ) شـێخ ئـەلبانی : ج٢ : ژ-٥٥١ . واتە : چاکترین ئیسلامەتی بڕوابوونە بە خوا .

**پ١٥: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی ئیسلام پێناسە کراوە بە پێنج پایە بە شێوەیەکی گشتی؟**

**و:** پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامی پرسیارێکی (جبريل) دا کە لێی پرسی ( ئیسلام ) چی یە ؟ فەرمووی ( الأسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله ، وتقيم صلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان ، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا ) واتە : ( ئیسلام بریتییە لەوەی کە شایەتمان بهێنیت کە (اشهد ان لا الـه الا الله وان محمـد رسـول الله) یە نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خـوا بکەیت گەر توانات هەبوو ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە .
لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتووە ( ئیسلام بونیادنراوە لەسەر پێنج پایە هـەر ئـەوەی دەسـت نیشان کـردووە کـە لەسـەرەوە باسمـان کـرد ) ئیمـام بوخـاری و موسـلیم ڕیوایەتیان کردووە.

**پ١٦: پلەو پایەی شایەتمان لە دیندا چی یە ؟**

و: هیچ کەسێك ناڕواتە دینی ئیسلامەوە تا شایەتمان نەهێنێت ، خوای بەخشندە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ الحجرات: ١٥ .

واتە : ( بێگومان ئیماندارانی ڕاست تەنها ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی خوا هێناوە ) .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت : ( امرت ان اقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا الـه الا الله وأن محمدا رسول الله ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( فەرمانم پێ دراوە کە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم هەتا شایەتمان دەهێنن بەوەی کە تەنها یەك پەرستراوی بە حەق هەیە و محمدیش پێغەمبەر و بەندە و نێراوی خوایە ) .

**پ١٧: بەڵگە لەسەر شایەتیدان بەوەی کە تەنها خوای پەروەردگار پەرستراوی ئەم بوونەوەرەیە ( اشهد أن لا اله الا الله ) چی یە ؟**

و: بەڵگەمان ئەم ئایەتەیە ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ آل عمران: ١٨ ، واتە : ( خوای گەورە شایەتی دەدات کە تەنها ئەویش بەسە بۆ شاهیدی دان) کە ڕاستگۆترین شاهیدە و لەو دادگەرتر نییە و دەریخستوە کە جگە لەزاتی خۆی پەرستراوێکی تر نییە بە حەق ، هەروەها فریشتەکان و خاوەن زانستەکان بەڕێگەیەکی ڕاست و دروست دەیسەلمێنن کە جگە لە خوا پەرستراوێکی تر نییە و ئەو زاتە خوایەکی بە دەسەڵات و دانایە لە فەرموودە کردەوە و بەرنامەکەیدا ) لە ئایەتێکی دیکەیشدا دەفەرموێت :

﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ﴾ المؤمنون: ٩١ واتە : ( هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە رۆڵەی خۆی و هیچ پەرستراوێکی نەکردووە بە شەریك و هاوەڵی خۆی نە لە دروستکردندا و نە لە بەڕێوەبردنی گەردووندا ) . ﴿قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُ آلِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّابْتَغَوْا إِلَىٰ ذِي الْعَرْشِ سَبِيلًا﴾ الأسراء: ٤٢ . واتە : ( ئەی محمد بڵێ (بەو بێ بڕوایانە) گەر خوای تریش هەبوایە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا وەك ئەوان دەیڵێن ئەوا هەمووان هەوڵیان دەدا دەسەڵات لەخاوەنی عەرەش زەوت بکەن ) .

## پ١٨: مانای شایەتیدان بە (اشهد أن لا اله الا الله) چی یە ؟

و: واتە بە دوورگرتن و نەفیکردنی ئەوەی کە هیچ شتێك هەبێت شیاوی پەرستن بێت بە هەق جگە لە خوای بەدیهێنەر ، و سەلماندنی شیاویی ئەو پەرستنەش بۆ خوای کاربەجێ کە هیچ هاوەڵ و شەریکێکی نییە لە پەرستندا ، بەهەمان شێوەش هیچ هاوەڵ و شەریکی نییە لە موڵکداری و بەڕێوەبردنی بوونەوەردا ، خوای کاربەجێ دەفەرموێت : ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ الحج: ٦٢ . واتە : ( بە ڕاستی خوا هەرخۆی حەق و ڕاستە چی ویستی لەسەر بێت دێتە دی و چی ویستی لەسەر نەبێت بوونی نابێت ، ئەوانەش هانا بۆ شتیتر دەبەن جگە لە خوا ئەوە هەر خۆی بەتاڵ و ناهەقیە ، چونکە نە قازانج و نە زیانیشیان هەیە ، بێگومان تەنها خوا بەرز و گەورەیە هیچ شتێك لەو بەرزتر نییە و هیچ شتێك لەو گەورە تر نییە ) .

**پ١٩: مەرجەکانی شایەتی دان (اشهد أن لا الـه الا الله) چی یە و ئـەو مەرجانـەی پێویستە لە دەربڕینی ئەو شایەتییەدا هەبێت چین ؟**

**و:** شایەتومان هەشت مەرجی هەیە پاش وتنی بە زمان :

**یەکەم :** زانینی ماناکەی لەهەر دوو ڕووی بەرپەرچدانەوە و جێگیر کردنەوە .

**دووەم :** بوونی یەقین لە دڵدا .

**سێیەم :** ملکەچ بوون بۆی بە ئاشکراو نهێنی .

**چوارەم :** قبوڵ بوونی تەواو بۆی ، و هیچ شتێك لـە داواکاری و فەرمانـەکانی نابێـت بەرپەرچ بدرێتەوە .

**پێنجەم :** دڵسۆزیی نواندن و نیەت پاکی .

**شەشەم :** ڕاستگۆیی لە دڵەوە نەك تەنها بەزمان .

**حەوتەم :** خۆشەویستی بۆ خواو دۆستانی خواو پشتگیری و دژایەتی لەسەر ئەم بنچینەیە بێت.

**هەشتەم :** مردن لەسەر ئەو ڕێبازە .

**پ٢٠ بەڵگە چیە لەسەر بەمەرج گرتنی ( زانین ) بوون لە چەسپاندنی مانـای یـەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟**

**و:** خوای تاك و تەنها دەفەرموێت : ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ﴾الزخرف: ٨٦ .

واتە : ( مەگەر کەسێك شایەتی ڕاستی دابێت ) . واتـە : ( شـایەتیدان بـە ( لا الـه الا الله ) و لە کاتێکدا ئەوەی بە زوبان دەیلێن بە دڵ ماناکەی دەزانـن و زانستیان هەیـە لە مەبەست و ماناکەی) پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت : ( من مات وهـو یعلـم ان لا

اله الا الله دخل الجنة ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( ئەوەی بمرێت و بزانێت کە تەنها خوا پەرستراوی جیهانیانە دەچێتە بەهەشتەوە ) .

## پ٢١: بەڵگە چیە لەسەر بە مەرج گرتنی (یەقین) لە چەسپاندنی یەکتاپەرستی خوادا لە قورئان و سوننەتدا ؟

و: بەڵگەمان ئەم ئایەتەیە ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾الحجرات: ١٥ .
واتە : ( بێ گومان بڕوادارانی ڕاست و تەواو تەنها ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەری خوا هێناوە و لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوامن و پاشان ناکەونە هیچ گومان و دوو دڵیەکەوە ، بە خۆیان و سەروو ماڵیان جیهاد دەکەن لە پێناوی خوادا ، لە ڕاستیدا هەر ئەوانە ڕاست و ڕاستگۆن ) .
هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( أشد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله لا يلقى الله بهما عبد غير الله فيهما الا دخل الجنة ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە .
واتە : ( شایەتی دەدەم بەوەی کە تەنها خوا پەرستراوی بە حەقە و من نێردراوی خوام هەر کەس بەڕاستی و بێ دوو دڵی (أشد أن لا إله إلا الله وان محمدا رسول الله ) بڵێت و گومانی نەبێت و بیسەلمێنێت بە کردەوە و بەو حاڵەتەوە بگەڕێتەوە بۆلای خوا دەچێتە بەهەشت ) .
پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە ئەبوو هورەیرە : ( فمن لقيت وراء هذا الحائط يشهد أن لا اله الله مستيقنا بها فبشره بالجنة ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە .
واتە : ( گەشتیت بە هەر کەس لە پشت ئەو بێستانەوە و شایەتیدا کە تەنها خوای

بەدەسەڵات پەرستراوی بەهەقە و یەقینی هەبوو لە دڵدا بەوەی کە دەیڵێت مژدەی بەهەشتی بدەرێ ) .

**پ٢٢: بەڵگە چیە لەسەر بە مەرج گرتنی ( ملکەچ بوون ) بۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟**

و: ئەم ئایەتە بەڵگەیە : ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ لقمان: ٢٢ . واتە : ( ئەوەی ڕوبکاتە پەروەردگاری و دڵسۆزی بنوێنێت لە کارەکانیدا و پابەندی شەرعی خوا بێت لە هەڵسوکەوتیدا و ملکەچ بێت بۆ بەرنامەی خوا ئەوە چاکەخوازە و پەیمانی توندی خوای پێ دراوە کە سزا نادرێت و لە ڕزگار بووانە ) .

**پ٢٣: بەڵگە چی یە لسەر بە مەرج گرتنی ( ڕازی بوون )بۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟**

و: خوا سەبارەت بەوانەی کە ڕازی نین بەیەکتا پەرستی دەفەرموێت ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴿٣٦﴾﴾ الصافات: ٣٥-٣٦ . واتە : ( بێ بڕوایان لە کاتێکدا پێیان بوترێت جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکیتر نییە خۆیان بەگەورە دەگرن و دەڵێن چۆن ئێمە خواکانی خۆمان واز لێبهێنین بۆ قسەی شاعیرێکی شێت ) ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێت ( مثل ما بعثنى الله بة من الهدى و العلم كمثل الغيث الكثير أصاب ارضا فكان منها نقية قبلت الماء فأنبتت الكلأ و العشب الكثير و كان منها أجادب امسكت الماء فنفع الله به الناس فشربوا وسقوا وزرعوا ، وأصابت منها طائفة أخرى انما هى قيعان لا تمسك ماء ولا تنبت كلأ فذلك

مثل من فقه في دين الله ونفعه ما بعثني الله به فعلم وعلم ومثل من لم يرفع بذلك رأسا ولم يقبل هدى الله الذى أرسلت به ) ئيمام بوخاری و موسليم ڕيوايەتيان كردووە. واتە : ( وێنەی ئەو زانست و ڕێنماييەی كە خوا بەمندا ناردوويەتی بۆ مرۆڤەكان وەك بارانی زۆر وايە كە بەسەر زەوييەكی بە پيتدا ببارێت و ئاوەكە هەڵمژێت و لەوەڕگای زۆری تێدا سەوز ببێت و خەڵكی و گياندارانی لێی سودمەندبن ، و بەسەر زەوێكی ڕەقدا ببارێت و ئاوەكە لەسەر زەوی بمێنێتەوە و ببێتە ڕووبار خەڵكی بيخۆنەوە و ئاوی گيانداری خۆيانی پێ بدەن و كشتوكاڵيانی پێ ئاو بدەن ، يان باران ببارێت بەسەر زەوێكی فشەڵدا نە ئەوەيە هەڵی بمژێت و نە ئەوەيە لەسەری ڕاوەستێت ، وێنەی ئەمە وەك يەكێكە كە شارەزا بێت لە دينی خواوە سوودمەند بێت لەو پەيامەی كە خوا بۆی ناردووە و خۆی فێربكات و خەڵكيش فێربكات و وێنەی ئەويتريشيان وەك ئەمە وايە نە خۆی سوودمەند بووە و نە سووديش دەگەيەنێ و قبوڵی ئەو پەيامەی نەكردووە ) .

## پ٢٤: بەڵگە چی يە لەسەر بە مەرج گرتنی دڵسۆزی بۆ چەسپاندنی يەكتاپەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟

و: خوای بەتوانا دەفەرموێت : ﴿فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ الزمر: ٢ . واتە : ( خوا بپەرستەو كە هيچ هاوەڵ و شەريكی بۆ خۆی بڕيار نەداوە و خەڵكيش بۆ ئەو ڕێبازە بانگ بكە و فێريان جگە لە زاتی خوا هيچ شتێك شياو نی يە بۆ پەرستن و خواش نە شەريكی هەيە و نە هاو شێوە ) ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموويەنی : ( أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا اله الا الله خالصا من قلبه) ئيمام بوخاری و موسليم و ئەحمەد ڕيوايەتيان كردووە . واتە : ( بەختەوەرترين كەس كە شەفاعەتی من ئەيگرێتەوە ئەو كەسەيە كە بەدڵسۆزی و نيەتپاكی لە دڵيەوە بڵێ : جگە لە خوا هيچ پەرستراوێكی بە هەق نييە ).

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( ان الله قد حرم علی النار من قال لا اله الا الله یبتغی بذلك وجه الله ) ئیمام بوخاری ریوایەتی کردووە .
واتە : ( خوای تاك و تەنها حەرامی کردووە لەسەر دۆزەخ کە بیسوتێنێ هەرکەس لەبەر خوا بڵێ ( لا اله الا الله ) ) .

## پ٢٥ : بەڵگەی مەرج گرتنی ڕاستگۆیی بۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا چیە ؟

و: خوای تاك و تەنها دەفەرمووێت:﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾ العنكبوت: ٣.
واتە : ( ئایا خەڵکی وا حساب دەکەن و وادەزانن کە پشتگوێ دەخرێن و وازیان لێ دەهێنرێت کە تەنها بە زمان بڵێن بڕوامان هێناوە و تاقی ناکرێنەوە ، بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقی کردۆتەوە و ئەمانیش تاقیدەکەینەوە هەر کەس بە پێ ی پلەی بڕوا و ئیمانی خۆی تا خوای گەورە دەریبخات بۆتان کە کێ ڕاستی کردووە و کێ ناڕاست و درۆزنە ) ،پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی : ( ما من أحد یشهد أن لا اله الا الله وأن محمد رسول الله صدقا من قلبه الا حرمه الله علی النار ) ئیمام بوخاری ریوایەتی کردووە .
واتە : ( هیچ کەس نی یە کە شایەتمان بهێنێت و بڵێت : ( أشهد أن لا اله الا الله و أن محمد رسول الله ) بەڕاستی و لە دڵیەوە بێت خوای بەرز و بە توانا لەسەر دۆزەخی حەرام دەکات کە بیسوتێنێ ) .
هەروەها قسەی کابرای دەشتەکی کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دروشمەکانی ئیسلامی بۆ باس کرد . ئەویش ووتی : بە خوا قەسەم نە زیاد لەوە دەکەم و نەکەمتر

لەوە ئەنجام دەدەم ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی : ( افلح ان صدق ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( ڕزگاری بووە گەر ڕاست بکات ) .

**پ٢٦: بەڵگەی بە مەرج گرتنی خۆشەویستی بۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی خوا لە قورئان و سوننەتدا چی یە ؟**

**و:** خوای بەرزو بە دەسەلات دەفەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾ المائدة: ٥٤ .

( ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەر کەس لە ئێوە لە دینەکەی خۆی پاشگەز بێتەوەخوا کۆمەڵێك دێنی خوای گەورە ئەوانی خۆش دەوێت و خوای گەورەش ئەوانی خۆش دەوێ)

پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی : ( ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الايمان أن يكون الله و رسوله أحب اليه مما سواهما وأن يحب المرء لاَ يحبه الا الله و أن يكره أن يعود فى الكفر بعد ان أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف فى النار ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : هەرکەسێك سێ مەرجی تێدا هاتەدی تام و چێژی ئیمان هەست پێ دەکات:

<u>یەکەم :</u> خواو پێغەمبەری لە هەموو شتێك زیاتر خۆش بوێت.

<u>دووەم :</u> هەر کەسێکی خۆش ویست لەبەر خاتری خوا خۆشی بوێت.

<u>سێیەم :</u> گەڕانەوەی بۆ کوفر ئەوەندە پی ناخۆش بێت وەك ئەوە وابێت بەلایەوە کە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە.

**پ٢٧: بەڵگە چی یە لەسەر دۆستایەتی و دوژمنایەتی لە پێناو خوادا ؟**

**و: خـوای تـاك و تـەنها دەفـەرمووێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ﴾ المائدة: ٥١ .**

**واتە : ( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکە و گاور مەکەنـە دۆسـت و پـشتیوانی خۆتان ، ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یـەکترن و هەرکەسـێك پـشت بـەوان ببەستێت ئەوە هەر لەوانە و حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت ) ،**

**هـــەروەها دەفـــەرموێت : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ﴾ التوبة: ٢٣ .**

**واتە : ( ئەی ئیمانداران باوانتان و براکانتان مەکەنـە دۆسـت و خۆشەویستی خۆتـان گەر کوفریان هەڵبژارد بە سەر ئیمان و شەریعەتدا ) .**

**هـــەروەها دەفـــەرموێت : ﴿لَّا تَجِدُ قَوۡمٗا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ يُوَآدُّونَ مَنۡ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ المجادلە: ٢٢ . واتە : ( هیچ کۆمەڵێك نابینیـت ئیمانیـان هـەبێت بە خواو پێغەمبەری خوا کە دۆستایەتی بنوێنن بەرانبەر بـە کەسـێك سـنووری خـواو پێغەمبەرەکـەی ببـەزێنێت ) ، هـەروەها دەفـەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ الممتحنة: ١ .**

**واتە : ( ئەی ئیمانداران هـەرگیز دۆسـتایەتی مەکـەن لەگـەڵ دوژمنـی مـن و دوژمنـی خۆتاندا کە بێ بڕوا و کافر و ستەمکاران بەرانبەر بە خوا و پێغەمبەر و موسڵمانان ).**

**پ۲۸: بەلگەی شایەتیدان بەوەی کە محمد ﷺ نێردراوی خوایە چی یە ؟**

و: بەلگەمان قورئانە کە دەفەرموێت :﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ آل عمران: ١٦٤ .

واتە : ( بێگومان خوا منەتی ناوە بەسەر ئیماندارانـدا بـەوەی کـە لـە نـاو خۆیانـدا پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون کە موحەممەدە ، کە ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەرونیان پاك و پوخت دەکاتەوە و فێری قورئان و داناییان دەکات ) .

وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة: ١٢٨ .

واتە : ( ئەی خەڵکینە بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ نێردراوە کە یەکێکە لە خۆتان کە محمدە و زۆر سەختە بـە لایـەوە کـە ئێـوە توشـی بـەڵا و ناخۆشـی بـبن ، زۆر بەتەنگتانەوە دێت زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و دلۆڤانە بۆیان ) .

**پ۲۹: مانای شایەتیدان بەوەی کە محمد نێردراوی خوایە چی یە ؟**

و: بریتییە لـە بـە ڕاسـت زانینێکـی دوور لـە هـەموو گومانێـك لـە دڵـەوە و دووپاتکردنەوەی ئەو بە ڕاست زانینە بە زمان کە محمد بەندەی خواو نێردراوی خوایە بۆ هەموو مەردووم و پەرییەکان . خوای دانا و زانا دەفەرموێت ﴿شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾﴾ الأحزاب: ٤٥-٤٦ ،

واتە : ( ئەی محمد ئێمە تۆمان ناردووە کە شایەت بیت بەسەر ئوممەتی ئیسلامەوە

مژدەبەخش بیت بۆ ئیمانداران و ترسێنەریش بیت بۆ ستەمکاران هەروەها بانگەواز بکەیت بۆ پەرستنی خوا بە مۆڵەتی خۆی و چرایەکی ڕووناکیش بیت بۆ سەرجەم سەرگەردانان ) . وە هەروەها پێویستە لەسەرمان بڕوا بێنین بەوەی کە سەبارەت بە ڕابووردوو پێ ی ڕاگەیاندووین وە دڵنیا بین لە ڕوودانی ئەو هەواڵانەی کە ئاگاداری کردووین بۆ داهاتوو ، و پابەند بین بەو ڕێباز و بەرنامەیەی دیاری کردووە و خۆ بە دوور بگرین لە هەر شتێك قەدەغەی کردووە لێمان ، و بڕوامان بەوە هەبێت کە گوێڕایەڵی پێغەمبەر گوێڕایەڵی خوایە و سەرپێچیکردن لە بەرنامەکەی سەرپێچی لە خوایە . هەروەها بڕوامان هەبێت بەوەی کە خوای گەورە پێغەمبەری لە ژیاندا هێشتەوە هەتا پەیامی ئیسلامی بە تەواوی بە ئوومەتەکەی ڕاگەیاندو بەڵگەکانی بۆ ڕوون کردوونەتەوە و هیچ شتێك نەماوە سەبارەت بەدین کە پێغەمبەر شینەکردبێتەوە .

**پ٣٠: مەرجی شایەتیدان بەوەی کە ( محمد ) نێردراوی خوایە چی یە و ئایا شایەتی دانی یەکەم بەبێ شایەتی دانی دووەم وەردەگیرێت ؟**

و: وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکردووە کە مرۆڤ ناچێتە بازنەی ئیسلامەوە بەبێ وتنی ئەو دوو شایەتی دانە ، و هەر دووکیشیان پەیوەستن بەیەکەوە و مەرجی شایەتی دانی یەکەم مەرجە بۆ دووەم و مەرجی شایەتی دووەمیش مەرجە بۆ یەکەم.

**پ٣١: بەڵگەی فەرز بوونی نوێژ و زەکات چی یە ؟**

و: خوای بێ هاوتا دەفەرموێت : ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْۚ﴾ التوبة: ٥ . واتە : ( ئەگەر تۆ بەیان کرد (کە بریتی یە لە واز هێنانیان لە

پەرستراوێکی تر) و نوێژیان بەجێ هێناو زەکاتیان دا وازیان لێ بهێنن و ئازادیان بکەن ) ، هەروەها دەفەرموێت : ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ﴾ التوبة: ١١ . واتە : ( ئەگەر تۆبەیان کرد و نوێژیان بە جێ هێنا و زەکاتیان دا ئەوا براتانن لە دیندا ) ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ البينة: ٥ . واتە ( تەنها فەرمانیان پێکراوە کە خوا بە دڵسۆزی بپەرستن و پابەندبن بە ئاینەکەی ئەوەوە و لە هەموو شتێکی دیکە واز بهێنن جگە لە ئاینی خوا و نوێژ بەجێ بهێنن و زەکات بدەن ) .

## پ٣٢: بەڵگەی فەرز بوونی ڕۆژوو چی یە ؟

و: خوای ڕێزی دەر دەفەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ البقرة: ١٨٣ .

واتە : ( ئەی ئیمانداران ڕۆژووتان لەسەر فەرز کراوە هەروەك چۆن لەسەر نەتەوەکانی پێش خۆتان فەرز کرابوو ) .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾ البقرة: ١٨٥ . واتە (هەر کەسێکتان مانگتان بینی لە ڕەمەزاندا بەڕۆژو بن ) جارێکیان کابرایەکی دەشتەکی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئایا خوا چی فەرز کردووە لەسەرم بۆ ڕۆژوو ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ( وصیام شهر رمضان فقال هل علی غیره ؟ فقال لا إلأ أن تطوع ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە :

( مانگی ڕەمەزان فەڕزە بۆ ڕۆژووگرتن ووتی هیچی ترم لەسەرە ؟ فەرمووی نەخێر مەگەر خۆت شتێکی زیاتر بگریت ) .

## پ٣٣: بەڵگەی فەڕز بوونی حەج چی یە ؟

و: خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ البقرة: ١٩٦ ، واتە : ( حەج و عومرە بە جێ بهێنن بۆ خوا ) ، هەروەها فەرموویەتی ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ آل عمران: ٩٧ . واتە : ( فەرزی خوایە لەسەر خەڵکی حەج کردنی کەعبە بۆ هەر کەسێك توانای هەبێت ) پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی : ( یا أیها الناس قد فرض الله علیکم الحج فحجوا ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( ئەی خەڵکینە خوای گەورە حەجی لەسەر موسڵمانان فەڕز کردووە حەج بکەن ) ، هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە ئیسلام لەسەر پێنج پایە پێك هاتووە کە یەکیان حەجی ماڵی خوایە .

## پ٣٤: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە ئینکاری فەرزبوونی یەکێك لە پایەکانی ئیسلام بکات یان دان بنێت بە فەرز بوونیدا بەڵام خۆی بە گەورە بگرێت و جێ بەجێ ی نەکات ؟

و: ئەکوژرێت بە کافری وەك هەموو درۆزنەکان و خۆ بەزل زانەکانی تری وەك ئیبلیس و فیرعەون .

**پ٣٥: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە بڕوای هەبێت بە فەرزەکان بەلام واز لە یەکێکیان بهێنێت بەهۆی تەمەڵی یان تەئویل کردن ؟**

و: نوێژ هەرکەس دوای بخات و نەیکات لە کاتی خۆیدا لەبەر تەمبەڵی یان تەئویل کردن ئەوا یەکەمجار داوای تۆبە کردنی لێ دەکرێت ئەگەر تۆبەی نەکرد ئەوا دەکوژرێت بە بەلگەی ئەم ئایەتە : ﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ﴾ التوبة: ٥ . واتە : ( ئەگەر تۆبەیان کرد کە بریتی یە لە واز هێنانیان لە بت پەرستی) و نوێژیان بەجێهێنا و زەکاتیان دا وازیان لێ بهێنن و ئازادییان بکەن ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (( أمرت أن اقاتل الناس حتى يشهدوا أن ألا اله الاّ الله وأن محمدا رسول الله )) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( فەرمانم پێ کراوە کە جەنگ لەگەڵ خەلکی بکەم تا شایەتی دەدەن کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی تر نی یە و (محمد) نێردراوی خوایە ) ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەس واز لە نوێژ بهێنێت دەبێت داوای تۆبەی لێبکرێت ئەگەر نەیکرد ئەوا دەکوژرێت[٢]

بەلام دەربارەی زەکات ئەو کەسانەی کە نایدەن ئەوا پێشەوای موسلمانان بە زۆر لێیان وەردەگرێت خۆ ئەگەر کۆمەڵ بوون وهێزو توانایان بوو فەرزە لەسەر پێشەوای موسلمانان کە جەنگیان لەگەڵدا بکات و بە زۆر لێیان وەربگرێت ، بەلگەی ئەمەش ئەو هەلوێستەی ئەبوبەکری صدیق ( ڕەزای خوای لێ بێت ) . هەروەها ئەوەی هاوەلانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە کردیان دژی ئەوانەی کە زەکاتیان نەدا . بەلام

---

[٢] چەسپاندنی ئەم حوکمانە نابێت تاك پێ ی هەستێت بەلکو دەسەلاتی ئیسلامی بڕیاری چەسپاندنی ئەو حوکمانە دەدات .

ڕۆژوو هیچ شتێکی لە بارەوە نەوتراوە ، بەڵام پێشەوای موسڵمانان یان وەکیلەکەی دەتوانێت سزایان بۆ دابنێت بە جۆرێك کە ئەو کەسانەو هاو شێوەکانیان ڕابهێنرێت لەسەر ئەو خوا پەرستی یە .

بەڵام حەج کردن بە درێژایی تەمەنی مرۆڤ یەك جار لەسەری فەرزە و لە دەستی ناچێت بە مردن نەبێت ، هەروەها واجبە لەسەر ئەو کەسە کە هەوڵی بۆ بدات . خوای گەورەش هەڕەشەی قیامەتی لەو کەسانە کردووە کە کەمتەرخەمی دەکەن لە جێ بەجێ کردنیدا و هیچ سزایەکی دیاری بۆ دانەنراوە لە دونیادا .

## پ٣٦ : ئیمان چی یە ؟[٢]

و: ئیمان گوفتار و کردارە ، گوفتاری دڵ و زمان ، کرداری دڵ و زمان و کردارەکانی لەشە ، و ئیمان بە گوێ ڕایەڵی زیاد دەکات و بە سەرپێچی و تاوانیش کەم دەکات و ئەهلی ئیمان وەك یەك نین و بەرز و نزمییان لە نێواندا هەیە .

## پ٣٧ : بەڵگە چی یە کە ئیمان کردار و گوفتارە ؟

و: خوای کار بە جێ دەفەرمووێت : ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾الحجرات: ٧ . واتە :(خوای گەورە ئیمانی خۆشەویست کردووە لە دەروونتاندا و جوانی کردووە لە دڵەکانتاندا ) ، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ١٩٨ ﴾ الاعراف: ١٩٨ . واتە : ( بڕوا بهێنن بە خواو پێغەمبەری خوا ) ئەمەش واتای ئەو دوو شایەتی دانەیە کە بەندە

---

[٢] الأيمان : لە زمانەوانیدا بەمانای ( التصديق ) : بە ڕاست دانان دێت .

ناچێتە چوار چێوەی ئیسلامەوە بەو شایەتیدانە نەبێت . ئەویش کرداری دڵە بەشێوەی بڕوابوون ، کرداری زوبانە بە گوتن ، و سودی نی یە ئەگەر هەردوکیان پێکەوە نەبێت.خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ البقرة:١٤٣.
واتە : ( خوا نوێژەکانتان بە زایە نادات ) . مەبەستی پێی ئەو نوێژانەیە کە ڕوویان کرد بوویە ( بيت المقدس ) پێش گۆڕینی قیبلە ، و نوێژ ناو براوە بە ئیمان لەبەر ئەوەی دڵ و زوبان و ئەندامەکانی لەش بەشدارە لە بە جێهێنانی دا .
پێغەمبەری خوا (ﷺ) جیهاد و مانەوە لەشەوی قەدردا و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و شەونوێژ کردن و بەخشینی پێنج یەکی ماڵی داناوە بە ئیمان ، و پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) : چ کردەوەیەك لە هەموو شتێك چاکترە ؟ فەرمووی ( ئیمان هێنان بە خواو پێغەمبەری خوا ) .

## پ٣٨: بەڵگە چی یە لەسەر زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لِيَزْدَادُوٓاْ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ﴾ الفتح: ٤ .
واتە : ( تا ئیمانیان زیاد بکات لەگەڵ ئیمانی خۆیاندا ) .
﴿وَزِدْنَـٰهُمْ هُدًى﴾ الكهف: ١٣ واتە : ( زیاتر نورو هیدایەتمان پێ بەخشین ) .
﴿إِيمَـٰنًا فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا﴾ التوبة: ١٢٤ ، واتە : ( ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ئیمانیان بە ئایەتەکان زیادی کردووە ) پێەمبەری خواش (ﷺ)دەفەرموێت : ( والذى نفسى بيده لو تدومون عندى وفى الذكر لصافحتكم الملائكة على فرشكم وفى طرقكم ولكن ياحنظلة ساعة وساعة ثلاث مرات ) ئیمام موسلیم و ترمزی ڕیوایەتیان کردوە .

واتە : ( بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو حاڵەتەی کە لەلای منن و یادی خوا بەردەوام بکەن ، ئەوا فریشتەکان تەوقەتان لەگەڵ دەکەن لەسەر جێگەتان و لە ڕێگاکانتاندا ، بەڵام ئەی حەنزەڵە ئەو حاڵەتە ساتێك لە بەرزیدایە و ساتێك لە نزمیدایە ، سێ جار ئەمەی دوبارە کردەوە).

## پ٣٩ ، بەڵگە چی یە لەسەر پلە جیاوازی ئەهلی ئیمان ؟

و: خوای گەورە لە سورەتی ( الواقعة )دا باسی دوو کۆمەڵمان بۆ دەکات لە ئیمانداران ( السابقون وأصحاب اليمين ) واتە : ئەوانەی پێشبکەوتوون و ئەوانەی یارانی لای راست کە هەر یەکیان لە قیامەتدا پاداشتێکی هەیە و جیاوازە لە یەکتر و خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ فاطر: ٣٢

واتە : ( هەیانە ستەمی لە خۆی کردووە و چاکەی کەمە و گوناهی زۆرە ، هەشیانە مام ناوەندیە ، هەشیانە زۆر گەرم و گوڕە لە چاکەکانیندا بەویست و یارمەتی خوا ) لە فەرمودەیەکیشدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( يخرج من النار من قال لا اله الا الله و كان فى قلبه من الخير ما يزن شعيرة ثم يخرج من النار من قال لا اله الا الله و كان فى قلبه من الخير ما يزن ذرة ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( لە ئاگر دەردەهێنرێت هەرکەسێ کە بڵێت ( لا اله الا الله ) و هێندەی دەنکە جۆیەك خێر لە دڵیدابێت ، پاشان هەرکەسێ بڵێ ( لا اله الا الله ) و هێدەی ( برە دەنکە گەنمێك ) خێر لە دڵیدا بێت لە دۆزەخ دەردەهێنرێت ، دوای ئەوە هەرکەس وتبێتی ( لا اله الا الله ) و هێندەی گەردیلەیەك خێر لە دڵیدا بێت لە ئاگر دەردەهێنرێت ) مەبەست بە خێر ئیمانە .

**پ٤٠: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی ئیمان هەموو دین دەگرێتەوە لە کاتی ناوبردنیدا؟**

و: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوەفدی ( عەبدالقیس ) فەرمووی : ( آمركم بالایمان بالله وحده ، قال : أتدرون ما الایمان بالله وحده ؟قالوا الله و رسوله أعلم قال : شهادة أن لا اله الا الله و أن محمدا رسول الله واقام الصلاة وإیتاء الزكاة وصیام رمضان وأن تؤدوا من المغنم الخمس ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( فەرمانتان پێ دەدەم بە بڕواهێنان بە خوای تاك و تەنها ، پاشان فەرمووی دەزانن بڕواهێنان بە خوای تاك و تەنها چی یە ؟ ووتیان : خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەزانن فەرمووی : شایەتی دانە بەوەی کە خوا پەروەردگاری جیهانیانە و محمدیش نێراوی خوایە و نوێژ کردن و زەکات دان و ڕۆژو گرتنی ڕەمەزان و دەرکردنی پێنج یەکی غەنیمەت لە جیهاددا ) .

**پ٤١: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی ئیمان پێناسە کراوە بەشەش پایە بەشێوەیەکی گشتی؟**

و: بەڵگەمان فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە کاتێکدا جوبرەیل پرسیاری لێ کرد سەبارەت بە ئیمان ؟ فەرمووی : ( أن تؤمن بالله و ملائكته وكتبه ورسله والیوم الآخر و تؤمن بالقدر خیره و شره ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( ئیمان ئەوەیە بڕوا بهێنیت بە خواو فریشتەکان و کتێبە خواییەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر بە خێر و شەریەوە ) .

**پ٤٢: بە کورتی بەڵگەی شەش پایەی ئیمان چی یە لە قورئاندا ؟**

و: خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ البقرة: ١٧٧ .

واتە : ( چاکەکردن ئەوە نییە کە ڕوو بکەیتە ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوا بەڵکو چاکە کردن ئەوەیە کە بڕوا بهێنی بە خواو ڕۆژی دوای و فریشتەکان و کتێبە خواییەکان و پێغەمبەران ) .

**پ٤٣: مانای بڕواهێنان بەخوا چی یە ؟**

و: بریتی یە لە بەڕاست زانینێکی تەواو لە ناو کرۆکی دڵەوە بە بوونی خوا کە لە پێش ئەوەوە هیچ کەس و شتێ شتێك نەبووە و لە پاش ئەویش هاوشێوەیەکی نی یە و یەکەم زاتە و هیچ شتێکی لە پێشەوە نی یە و کۆتایە و هیچ شتێك ناکەوێتە دوای ئەوەوە ، ئەو لەسەر و هەموو شتێکەوەیە و لەسەر و ئەوەوە هیچ نی یە ، هەمیشە زیندووە و ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾ الاخلاص: ٣-٤ واتە : ( نە لە کەس بووە و نە کەسی لێ دەبێت و هەرگیز هیچ کەس و هیچ شتێك هاو شێوە و هاو تاو هاو وێنەی خوا نیە لە تەواویی و کە ماڵیدا نە لە زات و نە لە سیفاتیدا ) . یەکتاپەرستی خواش لە پەرستن و تاك ناسینی ناوو سیفەتەکانی دا دەبێت بکرێت .

## پ٤٤: یەکتا پەرستی خوایەتی (ألوهية) چی یە ؟

و: بریتی یە لە بە تاك دانانی خوا لە پەرستندا بە هەموو شێوەیەك دیار و نادیارو بە کردار و گوفتار ، و دوورکەوتنەوە لە پەرستنی هەرشتێك جگە لە خوای بە دەسەڵات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ الاسراء:٢٣ واتە :( خوای بە توانا بڕیاری داوە کە جگە لەخۆی هیچ شتێك نەپەرسترێت ).

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾ النساء: ٣٦ . واتە : ( خوا بپەرستن و هیچ شەریکی بۆ بڕیار مەدەن ) . لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ﴾ طه: ١٤ .

واتە : ( بەراستی هەر من خوام هیچ پەرستراوێکی راست نیە جگە لە من کەواتە من بپەرستە بە چاکی نوێژ بەجێ بێنە تا منت بێتەوە یاد) (گە /١٤ .پوختەی تەفسیر ).

## پ٤٥: چ شتێك دژی یەکخواناسی خوایەتی یە ؟

و: دژی یەکتاپەرستی خوایەتی هاوبەش بڕیاردانە بۆ خوا کە ئەویش دوو جۆرە : هاوبەشی گەورە کە بە تەواوەتی دژی یەکتا پەرستی یە ، وە هاوبەشی بچوك کەماڵ و تەواوی یەکتاپەرستی لێڵ دەکات.

## پ٤٦: شیرکی گەورە چی یە ؟

و: بریتیە لەوەی کەسێك شتێك بپەرستێت و بیکاتە هاوشێوەی خواو لێی بترسێت و خۆشی بووێت وەك خۆشەویستی خوا ، داوای لێ بکات و بڕوات بە دەمیەوە ، پشتی

پـێ ببەسـتێت و بـە گـوێی بکـات و شـوێنی بکـەوێت وەك خـوا . خـوای گـەورە دەفـــەرموێت : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا﴾ النساء: ٤٨ . واتـە : ( بەڕاسـتی خـوا خـۆش نابێـت لەوانەی شەریکی بۆ بڕیار دەدەن ، جگە لەوە لە هـەر گوناهێکی تـر ئەگـەر بیـەوێت خـۆش دەبێـت ، ئـەوەی شـەریك بـۆ خـوا بڕیـار بـدات ئـەوە تـاوانێکی گـەورەی هەڵبەستووە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾ النساء: ١١٦ . واتە :( ئەوەی شەریك بۆ خوا بڕیار بدات ئەوە بێگومـان گومڕابـووە بـەگومڕابوونێکی دوور لە ڕاستی ) .

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت : ( فأن حق الله على العباد أن يعبدوه و لا يشركوا به شيئا و حق العباد على الله عز وجل أن لايعذب من لايشرك به شيئا ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( مافی خوایە لەسەر بەندەکانی کە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن و مافی بەندەکانە لەسەر خوا کە سزای ئەو کەسانە نادات شەریکیان بۆ خوا قەرار نەدابێت ) . جیاوازی نی یە هەرکەسێك بە ئاشکرا شەریك بۆ خوا قەرار بدات ، یان ئەوەی کە بە نهێنی شەریك بۆ خوا بڕیار دەدات وە وە چون یەکە پێی بە مشرکو هاوبەش بڕیاردانە ئەوان بە المكر الكفر دەکەن وەك بێبڕواکانی قورەیش و غەیری قورەیش ، ئەوەش وەك دوو ڕووەکان ( منافقين )ی مەدینە کە خۆیان بە مووسڵمان پیشان دەداو کوفری خۆیان دەشاردەوە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ

ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ الأنساء: ١٤٦ ، واته : ( به ڕاستی دووڕووەکان له قیامەتدا له چینی هەره خوارەوەی ناو دۆزەخدان و هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێك نی یه که ڕزگاریان بکات لەو سزایه تەنها ئەوانه ڕزگاریان دەبێت که تەوبەی ڕاستەقینه دەکەن و چاکه خوازن و به چاکی دەست به دینی خواوه دەگرن و دڵسۆزی بۆ دینی خوا دەنوێنن ، ئەوانه لەگەڵ ئیمانداراندان) .

## پ٤٧: شیرکی بچوك چی یه ؟

و: بریتیه له کەمێك ڕیاکردن له کارێکدا که ویستراوه بۆ خوا بێت ، خوای گەوره دەفەرموێت : ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ الكهف: ١١٠ ، واته : ( ئەوەی دەیەوێت پاداشت و بەزەیی خوایی دەست بکەوێت با کار و کردەوەکانی که ئەنجامی دەدات لەگەل شەرعی خوادا بگونجێ و به هیچ شێوەیەك له پەرستندا شەریك بۆ خوا بڕیار نەدات ) ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی : ( أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر فسئل عنه ؟ فقال الرياء ) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووه . ، واته : ( شتێك که زۆری لی بترسم که ئومەتەکەم توشی ببێت شیرکی بچوکه ، پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ؟ فەرمووی : ڕیا کردنه ــ ڕووپامایی ) ، له پاشاندا تەفسیری کرد و فەرمووی : ( يقوم الرجل فيصلي فيزين صلاته لما يرى من نظر الرجل إليه ) واته : ( پیاوێك هەڵدەستێت نوێژ دەکات و نوێژەکەی دەڕازێنێتەوه لەبەر ئەوەی کەسێکی تر سەیری بکات ) . جگه لەمەش هەندێ کاری تر به شیرکی بچوك دادەنرێت لەوانه سوێند خواردن به غەیری خوا وەك سوێند خواردن به باو باپیران و سوێند خواردن بەسەر و به کەعبه و به گەردن و .. هتد .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( لاتحلفوا بآ باءكم و لا بأمهاتكم ولا بالأنداد ) ئیمام ئەبو داوود ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( سوێند مەخۆن بە باوکتان و دایکتان و بتەکان ) هەروەها دەفەرموێت : ( ولا تقولوا والكعبة ولكن قولوا و رب الكعبة ) ئیمامی نەسائی ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( سوێند مەخۆن بە کەعبە ، بە ڵکو سوێند بەخوای کەعبە بخۆن ) هەروەها دەفەرموێت : (لاتحلفوا إلا بالله ) ) ئیمام ئەبو داوود ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( سوێند مەخۆن تەنها بە خوا نەبێت ) ، لە جێگایەکی دیکەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( من حلف بغير الله فقد كفر او اشرك ) ئیمام ئەبوداوود ترمذی ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( هەرکەس سوێند بە شتێکی تر بخوات جگە لە خوا ئەوا کوفری کردووە یان شەریکی بۆ خوا بڕیار داوە).

هەندێك قسەو گوفتاریش هەیە کە دروست نین و دەڕۆنە بازنەی شیرکەوە وەك : ( ماشاء ءالله شئت ) واتە : ( کە خوا و تۆ ویستان ) پێغەمبەر (ﷺ) جارێکیان پیاوێك ئەوەی پێ وت ، وەڵامی دایەوە فەرمووی : ( أجعلتنى لله ندا بل ماشاء الله وحده ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە ، واتە : (ئایا منت کردە هاوشانی خوا بەڵکو بڵێ تەنها خوا ویستی لەچی بێت و بەس ) ، نمونە زۆرە لەو قسانەی کە خراپە بۆ عەقیدەی هەر کەس بیڵێت لەوانەش : ( گەر خوا و جەنابت نەبوایە ) ( کەسم نییە خوا و جەنابت نەبێت ) ، ( دەژۆمە لای خوا و تۆ ) (بەسایەی خواو سەری تۆوە)، هەروەها نمونەی دیکەی لەم قسانە .. لێرەدا زانایان بەدروستی نازانن بەو شێوەیەی سەرەوە قسە بکرێت بەلام گەر وشەی ( لەپاشان ) بخرێتە نێوانیان دەگونجێت ، وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە ( لاتقولو ماشاء الله وشاء فلان ولكن قولوا ماشاء الله ثم شاء فلان ) ئیمام ئەبو داوود ڕیوایەتی کردووە، واتە:( مەڵێن خوا چی بوێت و فلان کەس ، بەڵکو خوا چی بوێت پاشان فلان کەس).

**پ٤٨: جیاوازی چی یە لە نێوان ( واو ) و ( ثم – پاشان ) بۆ ئەو قسانەی سەرەوە ؟**

و: لە زمانی عەرەبیدا ( واوی عاطفە ) یەکسانی و هاوشێوەی دەخوازێت ، ئەمەش هەر کەس بڵێ خوا چی بوێت و جەنابت ، دەستەڵات و توانای ئەو کەسە دە خاتە ئاستی دەستەلات و توانای خوای گەورە کە ئەمەش دەچێتە بازنەی شرکەوە ، بەڵام ( ثم –پاشان ) لە زمانی عەرەبیدا شوێن کەوتن و پاشکۆیی دەخوازێت واتە ئەگەر یەکێك بڵێت خوا چی بووێت پاشان جەنابت ، دان ئەنێت بە دەستەڵات و بەرزی خوای گەورەدا و ئەو دەستەڵاتەی ئەو کەسەش هەیەتی لەپاش دەستەڵاتی خوای گەورە دێت و لە ئاست و تواناد‌ا وەك یەك نین ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ الأنسان: ٣٠ . واتە : ( دڵنیابن هیچتان پێ ناکرێت و هیچ ویست و ئارەزوویەکتان پێ ئەنجام نادرێت مەگەر خوا خۆی ویستی لەسەر بێت ) .

**پ٤٩: یەکتا پەرستی پەروەردگاریەتی ( الربوبیة ) چی یە ؟**

و: بریتییە لە بڕوابوونێکی تەواو و بێ هیچ دوو دڵیەك کە خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکە و خولقێنەرە و بەدیهێنەریەتی لە بوندا و سەرپەرشتی و بەڕێوەبەری ئەم بونەوەرەیە و هیچ شەریك و هاوشێوەیەکی نی یە لە بونەوەردا ، هەرکات فەرمانێکی دەرکرد گەڕانەوەی نی یە و هیچ فەرمانێکی تریش نی یە بەسەر فەرمان و قسەی خوادا زاڵ بێت ، هیچ کەس و زاتێك نی یە کێشمە کێشی لەگەڵدا بکات بۆ دەستەڵات و خوایەتی لە مانا و کرداردا .

بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆر ئایەت هەن لە قورئاندا ، ئەمەش چەند نمونەیەکن : ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن

ذَٰلِكُم مِّن شَيْءٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ الروم: ٤٠ . واته : ( خوا ئەو زاتەیە کە دروستی کردوون و پاشان ڕزق و ڕۆزی پێ بەخشیوون و ئینجا دەتان مرێنێت لە ژیاندا و پاشان زیندووتان دەکاتەوە لە قیامەتدا ، ئایا هیچ کام لەوانەی کە کردوتانن بە هاوبەشی خوا و دەیان پەرستن شتی وایان لەدەست دێت بێ گومان هیچ لەوانە دەسەلاتی ئەو کارانەیان نی یە ، پاکی و بێ گەردی تەنها بۆ پەردوەردگارە لە شەریك بۆبڕیاردان وهاوشێوە و بووندا).هەروەها دەفەرموێت ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ﴾ الشوری: ١١ واته : ( هیچ شتێك نی یە لە وێنەی خوا ( نە لە زات و نەلە سیفاتدا ))

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴾ الأسراء: ١١١ . واته : ( وە بلێ سوپاس و ستایشی ئەو خوایە بکە کە بێ گەردە لە هەموو ناتەواویەك و کەسی نەکردووە بە نەوەی خۆی ، هەروەها لە مولك و مەملەکەتیدا کەس شەریك و هاوتای نی یە ، هەرگیز بەهۆی بێ دەستەلاتی و کەم توانیی یەوە کەسی نەکردووە بە یاوەر و یاریدەدەری خۆی هەمیشە خوا بەگەورە و مەزن بگرە ) .

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ( أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما الا دخل الجنة ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە .

واته : ( شایەتی دەدەم بەوەی کە تەنها خوا پەرستراوی بە هەقە و من نێراوی خوام هەر کەس بەڕاستی و بێ دوو دلی (أشهد أن لا إله إلا الله وان محمدا رسول الله ) بلێت و گومانی نەبێت و بیسەلمێنێت بە کردەوە و بەو حالەتەوە بگەڕێتەوە بۆلای خوا دەچێتە بەهەشت ) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بە ئەبوو هورەیرە : ( فمن لقيت وراء هذا الحائط يشهد أن لا اله الله مستيقنا بها فبشره بالجنة ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( گەشتیت بەهەر کەس لە پشت ئەو دیوارەوە و شایەتیدا کە تەنها خوای بەدەسەلات پەرستراوی ) .

## پ٥٠: چ شتێك دژی یەکتا پەرستی پەروەردگاریەتی یە ؟

و: لەو شتانەی دژی یەکتا پەرستی پەروەردگاریەتی یە ئەوەیە بڕوات هەبێت بەوەی جگە لە خوا زاتێکی تر یان کەسێك هەیە کە دەتوانێت کاریگەری هەبێت لەم بونەوەرەدا . لە بەدیهێنان یان نەهێشتن یان زیندووکردنەوە یان مردن یان چاکە هێنان یان لادانی خراپیەك ، یان هەرمانایەکی تری خوایی ، یان بڕوا بوون بەوەی کەزاتێك یان کەسێك هەیە وەك خوا لەناو و سیفەتەکانیدا ، وەك زانینی غەیب و گەورەیی و دەستەلات ، خوای گەورەدەفەرموێت : ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ﴾ یونس: ١٠٧ . واتە ( ئەی مرۆڤ ئەگەر خوا تووشی زەرەر و زیانێکی کردیت کەس ناتوانێت لای بدات لەسەرت مەگەر خوا بۆ خۆی ، ئەگەر خوا بیەوێت تووشی خێر و چاکەت بکات هیچ بەرگری کەرێك نی یە بۆ ئەو فەزڵ و بەخشیشە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ الأنعام: ٥٩ . واتە : ( کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنییەکان لای خوایەو کەس نایزانێت تەنها خوا خۆی نەبێت ) .

پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێت :خوای گەورە دەفەرموێت : ( العظمة إزاري والكبرياء ردائي – فمن نازعني واحدا منهما أسكنته ناري ) ئیمام موسلیم و

ئەبوداود ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( گەورەیەتی پۆشاکی خۆمەو خۆ بە گەورەگرتنیش بەرگی خۆمە هەرکەسێك بەربەرەکانی یەکیانم لەگەڵدا بکات نیشتە جێ ی دۆزەخی دەکەم ) .

**پ٥١: ئایا یەکتا پەرستی ناو و سیفەتەکانی چی یە ؟**

**و:** بریتی یە لە بڕواهێنان بەو سیفەتانەی کە خوا تاك و تەنها وەسفی خۆی پێ کردووە لە قورئاندا و پێغەمبەریش (ﷺ) وەسفی کردووە و ناوی هێناوە بە ناوەکانی و سیفەتە بەرزەکانی ، باسکردنی وەك خۆی بەبێ هیچ دەستکارییەك و هەر چۆن خوای گەورە باسی سیفەتەکانی کردووە لە قورئاندا بە بێ باسکردنی چۆنیەتەکەی لە چەندین شوێندا .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الشورى:١١ . واتە : ( هیچ شتێك نی یە لە وێنەی خوا بچێت ( نە لە زات و نە لە سیفەتیدا ) و خواش بیسەر و بینەرە ) هەروەها دەفەرموێت ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا﴾ طه: ١١٠ . واتە : ( خوا زانایە بە هەموو شتێك کە لە قیامەتدا چاوەڕێیانە ، بەهەموو ئەو شتانە کە لە دونیادا بە ئەنجامیان گەیاندووە ، خەڵكی هەرگیز ناتوانن ئاگاداری زانست و زانیاری خوا ببن ) .هەروەها دەفەرموێت :

﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ الأنعام: ١٠٣ . واتە ( هیچ چاوێك ( دەرکی حەقیقەتی ) خودا ناکات لە دنیادا ، و ئەو دەرکی حەقیقەتی هەموو بینابیەکان دەکات زاناو ئاگادارە بە هەموو شتێك ) .

**پ٥٢: بەڵگەی بوونی ناوەکانی خوا چی یە لە قورئان و سوننەتدا ؟**

**و: لە قورئاندا بەڵگە زۆرن ، لەوانە : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ﴾ الأعراف: ١٨٠ .**

**واتە : ( هەرچی ناوی جوان و ڕێك و پێك و بە ناوەڕۆك هەیە شایستەی خوایە و بەو ناوانەوە دوعا و نزا بکەن و واز بێنن لەوانە کە بێ بڕواو گومڕان بەناوەکانی خوا ) .**

**لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت : ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ طه: ٨.**

**واتە : ( ( الله ) ئەو پەرستراوە بە هەقەیە کە هیچ پەرستراوێکی تر نییە و هەر شایستەی ئەویشە ناوە ڕێك وپێك و چاکەکان ) بەڵگەی سوننەتیش پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( ان لله تسعة و تسعين اسما مائة الا واحدا من احصاها دخل الجنة ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( خوای تاك و تەنها نەوەد و نۆ ناوی هەیە لە سەدیەکێکی کەمە ئەوەی بیژمێرێت و کاری پێ بکات دەچێتە بەهەشت ) .**

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( أللهم أني أسالك بكل اسم هو لك سميت به نفسك أو أنزلته في كتابك أو علمته أحدا من خلقك أو استاثرت به في علم الغيب عندك أن تجعل القران العظيم ربيع قلبي ) ئیمام موسلیم و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە .**

**واتە : ( ئەی پەروەردگار داوات لێ دەکەم و دەپاڕێمەوە بە هەر ناوێك کە خۆت ناوی خۆتت لێ ناوە یان لە قورئاندا ناردووتە خوارەوە یان یەکێك لە بەندەکانی خۆتت فێر کردووە ، یان لە عیلمی غەیبدا لەلای خۆت هێشتووتەتەوە ، داوات لێ دەکەم قورئانی گەورە بکەیتە بوژێنەرەوەی دڵم ).**

**پ٥٣: نمونەی ناوە ڕێك و پێك و بەناوەڕۆکەکانی خوا ( أسماء الله الحسنى ) لە قورئاندا کامەیە ؟**

و: نمونە لە قورئاندا زۆرە لەوانە :

﴿إن الله كان علياً كبيراً﴾ الانبياء: ٣٤ . واتە : ( بێ گومان خوا بەرز و بڵند و گەورەیە )

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ الاحزاب: ٣٤ . واتە:( بەڕاستی خوا وردبینی ئاگادارە).

﴿إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ التوبە: ١١٧ . واتە : ( بێ گومان خودا بۆ ئەوان – ئیمانداران – بە سۆز و بەزەییە )

﴿أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ فصلت: ٥٣ . واتە : ( بێ گومان خودا لەسەر هەموو شتێك چاودێرو شاهیدە ) .

**پ٥٤: نمونەی ناوە ڕێك و بە ناوەڕۆکەکانی خوا چی یە لە سوننەتدا ؟**

و: نمونەش لە سوننەتدا زۆرە لەوانە :

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( یاحي یا قیوم یا ذا الجلال و الاکرام یا بدیع السموات و الارض ) ئیمام ترمیزی ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( ئەی هەمیشە زیندوی تەدبیرگەرو ڕاگری بوونەوەر ، ئەی خاوەن گەورەیی و بەخشش ، بەدیهێنەرەکانی ئاسمانەکان و زەوی ) .

**پ٥٥: نمونەی ناوە ڕێك و بە ناوەڕۆکەکانی خوا بەڵگە یە لە سەر چەند شت ؟**

و: ناوەکانی خوا دەکرێت بە سێ جۆرەوە :–

١.بەڵگەیە لەسەر زاتی خوا خۆی .

٢.بەلگەیە لەسەر ئەو سیفەتانەی کە لەو ناوەوە وەردەگیرێن و لە خۆی دەگرێت .

٣.بەلگەیە لەسەر ئەو سیفەتانەی کە لەو ناوەوە وەرنەگیراوە و پەیوەستن بەویشەوە .

**پ٥٦: نمونە لەسەر ئەو بابەتەی سەرەوە چی یە ؟**

**و:** نمونە زۆرن وەك ناوی پاك و بێ گەردی خوا ( الرحمن الرحيم ) واتە : ( بەخشندەو میهرەبان ) کە بەلگەیە لەسەر زاتی پەروەردگار خۆی وە هەروەها بەلگەیە لەسەر ئەو سیفەتیە کە لێی وەردەگیرێت کە بریتی یە لە بەخشندەیی و میهرەبانی خوا وە هەروەها بەلگەیە لەسەر ئەو سیفەتانەی کە بەخشندەیی و میهرەبانی دەخوازێت وەك ( ژیان ، توانایی ) چونکە ئەو سیفەتانە پێویستن بۆ سەلماندن و چەسپاندنی ئەو ناو و سیفەتانەی کە باسمان کرد ، بە پێچەوانەی دروستکراوەکانەوە کە هەیە ناو دەنرێت ( زانا ) بەلام لەهەمان کاتدا نەزانە بە زۆر شت ، مەرج نی یە زانستی بەسەر هەموو شتەکاندا هەبێت . وە یان ناو دەنرێت ( بەختیار ) بەلام لەهەمان کاتدا مەرج نی یە بەختەوەر بێت لە دونیادا .. هتد . پاك و بێ گەردی بۆ خودایە و ناو و سیفەتەکانی بەو شێوەیە کە خۆی وەسفی کردووە و لە سەرووی ئەوەوەیە کە مرۆڤەکان وەسفی دەکەن .

**پ٥٧: ناوەکانی خوا چەند بەش دەگرێتە خۆی ؟**

**و:** ناوەکانی خوا دەکرێت بە چوار بەشەوە :

ناوی ناسراوی خودا کە هەموو مانا و ناوەکان لە خۆ دەگرێت کە ئەویش ( الله ) یە لەبەر ئەوە هەموو ناوەکان دەبنە سیفەت بۆ ئەو ووشەیە و هەرگیز ووشەی ( الله )

نابێتە پاشکۆی هیچ ناوێکی تر وەك ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ﴾ الحشر: ٢٤ ، واتە : ( الله — ئەو خودایە بەدی دێنێت نەخشەو وێنە کێشەرە بۆ هەموو شتێك ) .

هەندێك ناو هەیە کە سیفەتێك لە خۆ دەگرێت وەك : ( السمیع — بیسەر ) کە سیفەتی بیستنی خوا دەگرێتەوە بۆ هەموو شتێکی پەنهان و ئاشکرا یان ( البصیر — بینەر ) کە سیفەتی بینینی خوا دەگرێتە خۆی بۆ هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا بچوك بێت یان گەورە یان ( علیم — زانا ) کە سیفەتی زانیاری دەگرێتەوە بۆ خوا بۆ هەموو ئەو شتانەی لەم بوونەوەرەدا هەیە ، ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ ﴾ سبأ: ٣ ، واتە : ( خوا گەورە زانایە بە نهێنی و شاراوەکان هەر خۆی دەزانێت کەی ئاشکرایان دەکات ئەگەر هەرشتێك بە بارستایی ئەتۆمێك بێت لە ئاسمانەکان و زەوی دا لە خوا پەنهان نابێت لەوەش بچوکتر بێت یان گەورەتر ) .

هەندێك لە ناوەکانی سیفەتی کاری خوا دەگرێتەوە وەك ( الخالق — خولقێنەر ) ( الرازق — ڕۆزی دەر )

هەندێك لەناوەکان پاك و بێگەردی و کەماڵی خوا دەسەلمێنێت وەك ( القدوس — پاك) ( السلام — بێ عەیب ، بێ پەڵە ) .

## پ٥٨: ناوەکانی خوا دەکرێت بە چند بەشەوە لە رووی ناو هێنا نمان بۆ خوا ؟

و: هەندێك لە ناوەکان دەتوانرێت بە تاك بۆ خوا بەکاربهێنرێت وە هەندێ جاریش دوو ناو بەیەکەوە دەبێت بەکاربهێنرێت کە بەرزی و پاك و بێگەردی خوا دەنوێنێت وەك ( الحی القیوم — زیندوو ڕاوەستاو ) ( الأحد الصمد — تاك و تەنیا و بێ نیاز و جێ ی نیاز ) بەڵام هەندێك لەناوەکان ئەگەر بەتاك ناو ببرێت ناتەواوی و کەم و

کورتی دەگەیەنێت لەبەر ئەوە پێویستە لەگەڵ بەرامبەرەکەیدا ناو ببرێت وەك ( الخافض الرافع – دانەوێن و نەویکەروە و بەرزکەرەوە ) ( المانع – پێشگیریکەر ) وە دروست نی یە بە تاکی بە خوا بوترێت ( الضار – زیانگەیەن بە دوژمن و ناحەزانی ) ( المذل – زەبوونکەر ) ( المانع – بەرگر ) چونکە ئەم جۆرە ناوانە نە لە نیگادا هاتووە و نە لەقورئاندا باسکراوە و نە لە سوونەتدا ئاماژەی پێ کراوە نموونەش بۆ ئەوە ناوی ( المنتقیم – تۆڵەستێن ) کە پێشگرێکی لە گەڵدا باس کراوە یان زۆر جار ووشەی ( ذو )ی لەگەڵدا هاتووە بۆ بەخشینی مانای بەرزی و بێ هاوتایی خوا وەك :

﴿إِنَّا مِنَ ٱلْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ السجدة: ٢٢ ، واتە : ( بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانباران و تاوانکاران دەسێنین ) ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ آل عمران: ٤ .

واتە : ( بێگومان خوا گەورە و بەدەسەلاتە و تۆڵەسێنەرە لە بێ باوەڕان ) .

## پ٥٩: نموونەی سیفەتی خۆیی یەکان ( ذات )[1] لە قورئاندا چی یە ؟

و: نمونە لە قورئاندا سەبارەت بە سیفەتە خۆییەکانی خوا زۆرن کە وەسفی زاتی خۆی دەکات ، لە وانە : ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾ المائدة: ٦٤ . واتە : ( بەڵکو هەردوو دەستی خوا بەردەوام کراوەیە و بەخشندەیە ) .

﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾ القصص: ٨٨ . واتە : ( هەموو شتێك تیا دەچێت تەنها زاتی خوا خۆی نەبێت ) .

﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ﴾ طه: ٣٩ ، واتە : ( تا لەژێر چاودێری خۆیدا گەورەبێت ) . (بوچاودێری و پارێزگاری خۆم) بۆ ئەوەی پەروەردە بکەییت بەپێی چاوی خۆم

---

[1] سیفەتی خۆییەکانی خوا وەك ( زانیاری ، ویست ، توانا ، دیتن ، بیستن ، روو ، هەمیشەیی ، کاربەجێی ) .

﴿إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ﴾ طه: ٤٦ . واته : ( من لەگوڵتاندام به عيلم و سەرخستن بۆتان و پشتگيری و پارێزگاريم بۆتان دەبيستم و دەبينم ) .

**پ٦٠: ئايا له سوننەتدا نمونەمان هەيه سەبارەت بەسيفەته خۆييەكان ؟**

و: بەڵێ له سوننەتدا نمونەمان زۆره ، لەوانه پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت : ( حجابه النور لو كشفه لأحرقت سبحات وجهه ما إنتهى اليه بصره من خلقه ) ئيمام موسليم ڕيوايەتی كردووه . واته : ( پەردەی ڕووی خودا له نووره ئەگەر لای بدات ڕووناكی ڕووی پەروەردگار هەموو دروستكراوەكان دەسوتێنێت ) .

هەروەها دەفەرموێت : ( ان الله لا يخفى عليكم ان الله ليس با عور ) ئيمام بوخاری و موسليم ڕوايەتيان كردووه .

واته : ( بێگومان خوای گەوره له ئێوه شاراوه نييه و بێ گومان خوای بەرز و بڵند دووره له هەموو ناتەواوييەك و كوێر نی يه ) .

هەروەها دەفەرموێت : ( أن يمين الله ملأى لا يغيضها نفقة سحاء الليل و النهار أو أيتهم ما أنفق منذ خلق السموات والأرض فإنه لم ينقص ما فی يمينه وعرشه على الماء وبيده الاخرى الفيض أو القبض يرفع ويخفض ) ئيمام بوخاری و موسليم ڕيوايەتيان كردووه .

واته : ( دەستی خوا پڕەو داينـاخات و بەخشينی شەو و ڕۆژ بەردەوامه ، نابينن لەو ڕۆژەی ئاسمانەكان و زەی خولقاندووه چەندی بەخشيوه لەگەڵ ئەو هەموو بەخشينه ئەوەی لەدەستی ڕاستيدايه كەمی نەكردووه ، وه عەرشی خوا لەسەر ئاوه

و بەدەستەکەی تریشی مولکی خۆی گرتووە بەویستی خۆی بەرزی دەکاتەوە و نزمی دەکاتەوە ) .

**پ٦١: نمونەی سیفەتە کارییەکان ( ألأفعال )[5] ی خوا چی یە لە قورئاندا ؟**

و: سیفەتەکارییەکانی خوا زۆر باس کراوە لە قورئاندا بۆ نمونە : ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ البقرة: ٢٩ ، واتە : ( خوا ئەو خوایە کە هەرچی لەزەویدایە دروستی کردووە بۆ ئێوە و پاشان ویستی لەسەر بوو ئاسمانەکان دروست بکات ) . (هو الذي خلقة لكم مافي الارض جميعاً ثم استوى الى سماء)

( عبدالرحمن ناصر السعدی ) دەلێت : ووشەی ( استوی ) لە قورئاندا بەسێ مانا دێت :

أ ) جاری وا هەیە مانای ( کەمالّ و پێگەشتووی ) دەبەخشێت ، وەك دەربارەی موسا ( علیه السلام ) دەفەرموێت ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ﴾ القصص: ١٤ ، واتە : ( کاتێك کە گەورە بوو گەیشتە پلەی کەمالّ و پێگەیشتن ) .

ب ) جاری وا هەیە مانای ( علا ، و أرتفع ) دێت ، وەك : ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ﴾ طه: ٥ ، واتە : ( خوای گەورە لە سەرووی عەرشی خۆیەتی ) .

ج ) جاری وا هەیە بەمانی ( قصد )ە ، وەك : ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ البقرة: ٢٩ ( تفسیر الکریم الرحمن ) ( پاشان ویستی لەسەربوو ئاسمانەکان دروست بکات ) .

---

[5] سیفەتە کارییەکانی خوا وەك ( بەرزبوونەوەی بەسەر ، هاتنی خوا بۆ ئاسمانی دونیا ، پێکەنین ، رازی بوون ، تورەیی ، شادی ) .

﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ﴾ البقرة: ٢١٠ ، واته : ( ئایا بێ باوەڕان جگە لە هاتنی خوا بۆ بڕیاردان چاوەڕێی چی دەکەن ) .

﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ﴾ الأعراف: ١٤٣ .

واتە : ( کاتێك خوای گەورە خۆی نیشانی کێوەکەدا سوتاو وورد و خاش بوو ) .

## پ٦٢: نمونەی سیفەتە کارییەکانی خوا کامەیە لە سوننەتدا ؟

و: نمونەمان لە سوننەتدا زۆرە تەنها دوو نمونە باس دەکەین :

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( ينزل ربنا كل ليلة الى سماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕوایەتیان کردووە . واتە : خوای گەورە هەموو شەوێك دادەبەزێتە سەر ئاسمانی دونیا بەو شێوەیەی شیاوە بە خۆی — کاتێ سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێت ) ، هەروەها دەفەرموێت : ( ان الله يقبض يوم القيامة الأرض وتكون السموات بيمنه ثم يقول أنا الملك ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( خوای گەورە زەوی دەگرێت بەدەستیەوە و ئاسمانەکانیش لە دەستی ڕاستیدان و پاشان دەفەرموێت من خاوەنی موڵکی ئەم بونەوەرەم ) .

## پ٦٣: ئایا لە سیفەتە کارییەکانی خوادا دەتوانرێت ناو دەربهێنرێت یان هەموو ناوەکانی خوا وەستێنراوە (توقیفی)[٦] ؟

و: هەموو ناوەکانی خوا وەستێنراوە ، واتە لە چاوگی کارێکەوە وەرنەگیراوە ، و هیچ ناوێك لە خوا نانرێت جگە لەو ناوانە نەبێت کە خوا خۆی ناوی هێناوە ، لە قورئاندا یان لە سوننەتدا پێغەمبەر (ﷺ) باسی کرد بێت .

[٦] ( توقیفی ) واتە : ناوەکانی خوا بواری عەقڵی مرۆڤ نادەن بۆ پەی پێ بردنیان لەبەر ئەوە نابێت نە لێ ی زیاد بکرێت و نەلێی ی کەم بکرێتەوە و بواری ئیجتیهادی تێدا نییە .

## پ٦٤: ناوی خوا ( العلي الأعلى ) چی دەگەیەنێت ؟

و: ناوی ( العلي الأعلى ) ئەو سیفەتەی کە لێی دەردەهێنرێت چەسپاندنی بەرزی خوا بەهەموو مەبەست و واتاکانی یەوە دەگرێتە خۆی .

- بەرزی خوا بەسەر عەرشەوە و بەرزی خوا بە سەر هەموو دروست کراوەکانیەوە ، چاودێرە بەسەر بونەوەردا ، هەموو کات زانیاری هەیە کە دروست کراوەکانی لەسەر چ حاڵەتێکن ، ئاگادار و زانیارە بەسەر هەموو شتێکدا و هیچ شتێکی لێ وون نابێت .
- بەرزی و دەستەڵاتی خوا ، بەو مانایەی هەموو شتێك ملکەچ و بەردەستی زاتی خوایە و هیچ دەستەڵاتێکیش نییە کە دژایەتی و بەرانبەر کێ و ڕێگری ئەو توانایە بکات ، هەموو شتێك لەم بونەوەرەدا مل کەچی گەورەییەتی ، ئەوەی لە بووندا هەیە زەبوونی گەورەیی و دەستەڵاتی خوایە ، لەژێر بار و ویستی ئەودایە ، هیچ کات و بۆ هیچ شوێنێك و هیچ کەسێك ناکرێت لە ژێر دەستەڵاتی دەربچێت .
- بەرزی زاتی خواش مەبەست ئەوەیە کە هەموو سیفەتە جوان و شایستەکان هی خوان و خواش دوورە لە هەموو سیفەتێکی ناشیاو دوورە لە هەموو ناتەواوییەك .

## پ٦٥: بەڵگەی بەرزی شوێنی خوا چی یە لە قورئاندا ؟

و: بەڵگەی بەرزی خوا و شوێنی خوا کە لە هەموو شتێك بەرزترە و لە ئاسماندایە و لەسەرو دروست کراوەکانیەتی لە چەندین ئایەتدا باس کراوە ، نمونەش لەسەر ئەوە

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ طه: ٥ . واتە : ( خوا بەسەر عەرشەوەیە و بەرز و بڵندە — بەو شێوەیەی جێی شایستەیە بۆی (خوای میهرەبان کە بەرزبۆوە سەر عەرش و قەراری گرت (بەو شێوەیەی شیاوی بێت چونیەکیەکەی نازانێت)) .

﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ الملك: ١٦ .

واتە : ( ئایا لەو زاتەی کە خوایە و لە ئاسماندایە ئەمینن ) .

﴿يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ﴾ النحل: ٥٠ .

واتە : ( ئەترسن لەو خوایەی کە لە سەر و ئەوانەوەیە ) . ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ﴾ المعارج: ٤ . واتە : ( فریشتەکان و جوبرەئیل بەرز دەبنەوە بۆ لای خوا )[٧]

﴿يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ﴾ السجدة: ٥ . واتە : ( ئەو خوایەی کەلە ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێك دەخات و سەرپەرشتی دەکات ) .

**پ٦٦ : ئایا بەرزی شوێنی خوا بەڵگەی لەسەرە لە سوننەتدا ؟**

**و:** بڵێ فەرمودەی زۆر لەسەر ئەوە هەیە کە خوا لە ئاسماندایەو ئەمەش چەند نمونەیەك لە و فەرموودانە : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت بە کەنیزەیەك : خوا لە کوێ یە ؟ ئەویش ووتی لە ئاسماندایە ، پێغەمبەر بە خاوەنەکەی ووت : ئازادی بکە ، چونکە ئەم کەنیزەیە ئیماندارە ( ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە ).

---

[٧] لە زۆر شوێندا ووشەی ( روح ) بە مانای جوبرئیل هاتووە تەنها لە هەندێ شوێنی کەمدا نەبێت .

هەروەها زەینەبی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) فەخری دەکرد بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەردا و دەیووت : ئیوه کەس و کارەکانتان بە شوویان داون بە پێغەمبەر بەڵام خوای تاك و تەنها لەسەر و حەوت ئاسمانەوه منی بەشوو داوه بە پێغەمبەر (ﷺ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە . پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت : ( من تصدق بعدل تمرة من كسب طيب ( ولا يصعد الى الله الا الطيب) فأن الله يتقبلها بيمينه)) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واته : ( هەرکەسێك بەقەدەر خورمایەك لە کاسبی موڵکی حەڵاڵی خۆی ببەخشێت ( ناڕواتە سەرەوە بۆ لای خوای گەورە ئەو بەخشینە ئەگەر لەماڵی حەڵاڵ و پاك نەبێت خوای گەورە بە دەستی وەری دەگرێت ) .

**پ٦٧: ئایا پێشەوایانی ئیسلام لە پێشینە صاڵحەکان سەبارەت بە ( استواء ) چیان فەرمووە ؟**

**و:** هەموو زانایان و پیاو چاکانی پێشینە یەك قسە بوون لەم مەسەلەیەدا کە ئەویش دەڵێنت ( استواء ) نەزانراو نی یە و زانراوە لەلامان چی یە ، بەڵام سەبارەت بە چۆنیەتی ئەو ( استواء )ە نەزانراوە و ئیمان هێنان پێ ی واجبە و پرسیار کردن سەبارەت بەو شتانە بدعەیە و ئەمەش پەیامی خوایە و لە لایەن پێغەمبەرەوە گەیەنراوە و لەسەر ئێمەش واجبە تەسلیم بوون و ملکەچ بوون بۆی بێ چەند و چوون ، لێرەدا پێویستە لەو شتە غەیبیانە نەدوێین و ئیمانی تەواویشمان پێ ی هەبێت بەبێ بیرکردنەوە لە چۆنیەتی یەکەی ، وەك خوای دادپەروەر دەفەرموێت : ﴿ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا﴾ آل عمران: ٧ . واته : ( ڕۆچوانی خاوەن زانست

دەفەرموون ئیمانمان هەیە کە قورئان هەمووەکەی ( موحکەم و موتەشابهی ) لەلایەن پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە ).

## پ: ٦٨ بەڵگەی بەرزی خوا و زاڵ بوونی لە قورئاندا چی یە ؟

و: بەڵگە زۆرە لەوانە : ﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ الأنعام: ١٨ . واتە : ( خوا ئەو زاتەیە کە زاڵ و بەرزترە بەسەر هەموو دروستکراوەکان و کارو باریشیان هەر بەدەستی ئەوە ) ، ﴿سُبْحَـٰنَهُۥ ۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ﴾ الزمر: ٤ . واتە : ( پاك و بێ گەردی بۆ خوای تاك و تەنها لە زات و سیفات و ناوو کاریدا ، بەهێزو توانایە بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا ) .

﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ﴾ هود: ٥٦ . واتە : ( هەرچی گیاندار هەیە لە بووندا ، جڵەوی ژیان و مردن و گشت کارێکیان بە دەستی خودایە ) .

## پ٦٩: بەڵگەی بەرزی خواو زاڵبوونی لە سوننەتدا چی یە ؟

و: بەڵگە زۆرن لەو بەڵگانەش کە لە سوننەتدا هەن لەسەر بەرزی و زاڵ بوونی خوا ، پێغەمبەر (ﷺ) هەرکات بڕۆشتایەتە ناو جێگەبۆ خەوتن دەیفەرموو : ( أعوذ بك من شر كل دابة أنت آخذ بنا صيتها ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( پەنا ئەگرم بەتۆ ئەی خوای پەروەردگار لە خراپە و شەڕی هەموو گیانلەبەرێك کە جڵەویان لە دەست تۆ دایە ) .

**پ٧٠: بەڵگە چییە لەسەر گەورەیی و باڵا دەستی خوای گەورە ( علو الشأن ) و ئەو سیفەتانە چین کە نابێت بدرێتە پاڵ خوای گەورە ؟**

و: گەورەیی و باڵادەستی خوای گەورە لە ناوەکانی دا ( القدوس ، السلام ، الكبير المتعال ) دەردەکەوێت ، یان هەر ناوێکی تر کە هەمان مانا و مەبەستی تێدا بێت ، خوای گەورە لە تاك و تەنهایی خۆیدا ،کەسی تر خاوەنی موڵك یان بە شێکی موڵك نی یە ، هاوکار و پشتگیری نیە ، هیچ تکا کارێك بەبێ مۆڵەت و ڕەزامەندی خۆی ناتوانێت تکا بکات ، خوا باڵا دەستە لە گەورەیی و دەسەڵات و هێز و تواناادا ، بە شێوەیەکە کە بەرهەڵستکاری نی یە ، کەس ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێ . باڵا دەستە لەوەی کەنەخێزان و نە کوڕ و باوك و نە لە هاوشێوە و نە هاوتای هەبێت ، چونکە خوایەکی ( صمد )ە ، بەدەسەڵاتە لە کەماڵ و ژیان و توانا و دەسەڵات و هێزی خودی خۆیدا بەشێوەیەك کە مردن و خەو و ماندووبوون و بێ توانایی و خەوبردنەوەی بەسەردانایەت . باڵا دەستە لە کەماڵی زانستدا ، بێ ئاگایی و لە بیر چوونی نیە و گەردیلەیەکی لێ نابێت لە هەموو زەوی و ئاسمانەکاندا ، بە دەسەڵاتە لە دانایی دا و سوپاسکراوە و هیچ شتێکی بێ مەبەست دروست نەکردووە وە دروست کراوەکانی بێ بەرنامە نە خولقاندووە ، بەڵکو فەرمان و قەدەغەکردن و زیندووبوونەوە و پاداشتی بۆ دیاریکردوون ، خوای باڵا دەست تەواوە لە دادپەروەریدا گەردێك ستەم لە کەس ناکات و لە چاکەکانی کەم ناکاتەوە . خوایەکی بەدەسەڵاتە لە دەوڵەمەندیدا پێویستی بە خواردن و ڕۆزی کەس نیە و پێویستی ناکەوێتە کەس لە هیچ شتێکدا ، لەو هەموو وەسفانەی کە خۆی پێی وەسف کردووە یان پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی کردووە ، هاوشێوەی نیە و یەکخستنی نیە ، پاك و بێگەردە و سوپاس کراوە بە دەسەڵات و پیرۆزە لە هەموو ئەو شتانەی کە

پێچەوانەیە بە خواوەندی و پەروەردگاریێتی و ناو و سیفەتە بەرزەکانی ﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ الروم: ٢٧ . واتە : ( هەر بۆ ئەو هەیە نمونەی هەرە بەرز لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر ئەویش زاڵ و بە توانا و دانا یە ) دەقەکان لە قورئان و سوننەت لەم ڕووەوە ئاشکراو زانراو و زۆرن .

## پ٧١: مەبەست لەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) چی یە دەربارەی ناوەکانی خوای گەورە کە هەرکەس بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە ؟

و: بە چەند مانایەك ڕاڤە دەکرێت : لەوانە لەبەرکردن و پاڕانەوە لە خوای گەورە و سوپاس کردن بەهەموو ناوەکانی ، هەروەها بەمانای ئەوەی کە شوێن کەوتەی ئەو ناوانە بێت ، وەك میهرەبانی و بەخشندەیی کە بەندەکان ئەم کارانە تیایاندا ڕەنگ بداتەوە و هەرکەس بەگوێرەی خۆی ، و ئەو ناوانەی کە تەنها تایبەتە بە خواوەند وەك : ( الجبار ، العظیم ، المتکبر ) پێویستە بەندەکانی دانی پێدا بنێن و باوەڕی پێ بهێنن ، و ئەم ناوانە لە خۆیان نەنێن ، و ئەوانەی مانای مژدەی تێدایە وەك : ( الغفور ، الشکور ، العفو ، الرؤف ، الحلیم ، الجواد ، الکریم ) دەبێت بەندەکان بەهیواو ئومێدەوە لە ئاستی ئەم ناوانە دا بوەستن و هەوڵی دەست کەوتنی بدەن . و ئەوانەی کە مانای هەڕەشە و تۆڵەی تێدایە وەك : ( العزیز ، ذی انتقام ، شدید العقاب ) پێویستە بەترس و بیمەوە لە ئاستیدا ڕاوەستن و هەوڵی خۆ ڕزگارکردن بدەن ، هەروەها هەستکردن بە مەبەستی ناوەکان و بە جێهێنانی هەقی خۆی بەرامبەر بەو ناوانە لە زانین و تێگەیشتن و پەرستن ، بۆ نمونە ئەو کەسەی بڕوای هێنابێت بە بەرز ( علو ) ی خوای گەورە بەسەر خەڵکەوە و بڕوا بوونی بە ( استواء) ی خوا لەسەر عەرش بە شێوەیەکی شیاو بەخۆی لەگەڵ ئاگایی ( احاطة ) ی خودا

بە خەڵکی بەزانست و دەسەڵاتی خۆی ، پێویستە پەرستن بەگوێرەی ئەم بڕوایە بێت بە شێوەیەك کە بەدڵ هەست بە بەرزی خوای گەورەبکات و بپارێتەوە لێی ، وە هەست بکات کە گوفتار و کرداری بەرز دەبێتەوە بۆ لای خوا و کە بە ئاگایە لە کردەوەکانی شەرم بکات لە لەوەی کردار و گوفتارێك بەرز بێتەوە بۆ لای پەروەردگاری مایەی سەر شۆڕی و ماڵوێرانی بێت و هەست بە فرمانەکان و کردارەکانی خوای گەورە بکات لە هەموو جیهاندا بە جۆرەها شێوە لە مراندن و زیندوو کردنەوە و سەرخستن و سەر شۆڕکردن و بەرز کردنەوە و دابەزاندن و پێدان و گرتنەوە و لابردنی بەڵا و دامەزراندنی ، و چەندەها ئیش و کاری خوای گەورە کە دەیکات لە موڵکیدا هیچ کەسی تر توانای کردنی نیە و خودا چۆنی بوێت ئاوا دەبێت: ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥٓ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴾ السجدة: ٥ . واتە : ( ئەو خوایەی کەلە ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێك دەخات و سەرپەرشتی دەکات لەوەودوا ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکان و کار و کردەوەی بەندەکان دەگەڕێتەوە بۆ لای لە ڕۆژێکدا کە بەرامبەر هەزار ساڵە بە حیسابی ئێوە ) ، هەرکەس حەقی دا بەناوەکانی خوا لە پەرستن و زانیندا ئەو کاتە خودای بەسە لە هەموو شتێکدا ، هەروەها ئەو کەسە هەست بکات بە زانینی ڕەهای خوای گەورە و بینین و بیستن و ژیان و ( دەستەڵات ) و سیفاتەکانی خوای گەورە ئەمانە سیفاتی بەندە نزیکەکانی خوای گەورەن ، وە پاداشتی بێ حیساب وەردەگرن .

## پ٧٢: چ شتێك پێچەوانەی یەکتاپەرستی ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوایە ؟

و: پێچەوانەکەی ( ألحاد ) نکۆڵی کردنی ناو و سیفەتەکانی خوا و بەڵگەکانیەتی ، ئەمەش سێ جۆرە:

یەکەم : نکۆڵی کردنی ئەوانەی شەریك بۆ خوا بڕیار دەدەن کە ناوەکانی خوایان گۆڕیوە و لایانداوە و بتەکانیان پێ ناو ناوە ، زیاد و کەمیان کردووە و گۆڕیویانە

وەك ( اللات ) لە ( اله ) و ( العزى ) لە ( العزيز ) و ( مناة ) لە ( المنان )ەوە وەرگرتووە .

دووەم : ئیلحادی ئەوانەی کە سیفاتی خوای گەورە دەشوبهێنن بە سیفاتی دروستکراوەکانی ، ئەمەش بەرامبەر بە ئیلحادی موشریکەکانە چونکە ئەوان دروستکراوەکانیان دەخستە هاوتا و یەکسانیان دەکرد بە پەروەردگاری هەموو جیهان ، ئەمانی تریش سیفەتەکانی خوایان دەهێنایە ئاستی لاشەیەکی دروست کراو و دەیان شوبهاند خوای گەورەش پاك و بێ گەردە لەوی دەدرێتە پاڵی .

سێیەم : ئیلحادی ئەوانەی سیفەتەکانی خوا لەکار دەخەن ( نەفی دەکەن ) ، ئەمانەش دووبەشن : بەشێکیان بەدیاردەیی دان دەنێن بە ناوەکانی خوای گەورە بەڵام ناوەڕۆکەکەی ڕەت دەکەنەوە کە سیفاتی کەماڵی خواوەندە ، دەڵێن بەخشندەو میهرەبانە بەڵام بەبێ ڕەحمەت نواندن و زانایە بەڵام بێ زانستە و بە دەسەڵاتە بەڵام بەبێ توانا .. هتد . بەشەکەی تریان بڕوایان وایە ناوەکان و ناوەڕۆکەکانی ڕەت بکەنەوە بە گشتی و بە نەبووی دادەنێن و دەڵێن نە ناوی هەیە نەسیفەت ، خوای گەورە بێ گەرد و بەتوانا و دەسەڵاتە لەوەی کە زاڵم و بێ بڕوایان و مولحیدان دەیلێن : ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا﴾ مریم: ٦٥ . واتە : ( خوای تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروست کراوەکانی نێوانیانە کەواتە هەر ئەو خوایە بپەرستن و بەردەوام و خۆگر بە لە پەرستنیدا ئایا هیچ شتێك هەیە هاو ناوی ئەو بێت و هاوتای ئەو بێ ؟ ) ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الشورى: ١١ ، واتە : ( هیچ شتێك نی یە لە وێنەی ئەو خوایە ( نە لە زات و نە لە سیفاتیدا )و هیچ شتێك لەو ناچێت چونکە خوایە و بەدیهێنەرە ، چۆن لە بەدیهێنراوەکانی دەچێت لە هەمان کاتدا

خوایەکی بیسەر و بینایە ) ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ﴾ طه: ١١٠ . واتە : ( وا بە هەموو ئەوشتانە دەزانێت کە لە قیامەتدا چاوەڕێیانە وە بە هەموو ئەو شتانەی ( کە لە دونیادا ) ئەنجامیان داوە وە ئەو خەڵکە هەرگیز ناتوانن ئاگاداری زانست و زانیاری ئەو خوایە بن ) .

## پ٧٣: ئایا هەموو جۆرەکانی یەکتاپەرستی پەیوەستن بەیەکەوە بڕوا نەبوون بە جۆرێکیان ئەوانیتر هەڵدەوەشێنێتەوە ؟

و: بەڵێ پێکەوە گرێ دراون و پەیوەستن بەیەکەوە ، هەرکەسێك شیرکی لە جۆرێکیان ئەنجام بدا ئەوا لەوانی تریشدا موشریکە ، نمونەش لەسەر ئەمە پاڕانەوە بۆ غەیری خوا ، داواکردنی شتانێك کە غەیری خوا توانای کردنی نی یە ، دوعا کردن خوا پەرستییە بەڵکو ناوکرۆکی خواناسییە هەر کەس دوعا بکات لە شتێك جگە لە خوا ئەوە شیرکی خوایەتی یە ( ألوهية ) و داواکردنی هەر پێویستیەك لە دەست خستنی خێر و چاکە و دوورخستنەوەی شەڕ و خراپە و بڕوابوون بەوەی کە کەسێك یان دەسەڵاتێك ئەو توانایەی هەیە لە بڕیارداندا جگە لە خوا ئەوە هاوبەش پەیدا کردنە لە پەروەردگارێتی دا ( الربوبية ) ، وا بڕوا دەکات کە لەگەڵ خوادا هەبێت ڕەفتار دەکات لە بوونەوەردا وە ناپاڕێتەوە لێی کاتێ نەبێ کە بڕوای وایە لە دوور و نزیکەوە گوێی لێ یە و لە هەرکات و شوێنێکەوە هاواری بۆ بکات ، ئەمەش ڕادەگەیەنن و بریتیە لە هاوبەش پەیداکردن لە ناو سیفاتەکانی خوادا ، سیفەتی بیستنی بۆ بڕیارداوە کە هەموو شتەکان دەبیستێ و دوور نزیکی بۆنیەو وە هاوبەش پەیدا کردن لە ( ألوهیە ت ) دا هاوبەش پەیداکردن لە پەروەردگارێتی و ناو سیفەتەکاندا دەگرێتەخۆ .

**پ٧٤: بەڵگە چی یە لەسەر بڕواهێنان بە فریشتەکان لە قورئان و سوننەتدا ؟**

**و:** بەلگەی زۆری لەسەرە لە قورئاندا لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾ الشورى: ٥ . واتە ( فریشتەکان سەرگەرمی تەسبیحات و ستایش و سوپاس گوزاری پەروەردگاریانن و داوای لێ خۆشبوونی لێ دەکەن بۆ ئیماندارانی سەر زەوی ) هەروەها : ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ﴾ الأعراف: ٢٠٦ ، واتە ( بێ گومان ئەو فریشتە بەڕێزانە کە لای پەروەردگارتن هەرگیز خۆ بە گەورە دانانێن لە پەرستنی پەروەردگاردا بەڵکو بەردەوام تەسبیحات و ستایشی دەکەن و سەجدە و کڕنوشی بۆ دەبەن ) ، هەروەها : ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ﴾ البقرة: ٩٨ ، واتە : ( ئەو کەسەی دژایەتی خواو فریشتەکان و پێغەمبەرەکانی و جوبرائیل و میکائیل بکات ئەوە با دڵنیا بێت کە خوا دوژمنی کافر و بێ باوەڕانە) و بڕواهێنان پێیان لە سوننەتدا فەرموودەی زۆری لەسەرە لەوانەش : ( خلقت الملائكة من نور وخلق الجان من مارج من نار و خلق آدم مما وصف لكم ) ئیمام موسلیم ریوایەتی کردووە . پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی ( فریشتەکان لە ڕووناکی – نور – دروست کراون و جنۆکەکانیش لە بڵێسەی ئاگر و ئادەمیش لەوەی بۆتان وەسف کراوە ( یانی لە قوڕ) دروست بووە ) .

**پ٧٥: مانای ئیمان هێنان بە فریشتە چی یە ؟**

**و:** بڕواهێنانە بە بوونیان و بڕواهێنان بەوەی کە یەکێکن لە دروست کراوەکانی خوا و ژێربار خراون لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ کاری تایبەت کە بۆیان دیاری کراوە ،

وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ﴾ الأنبياء: ٢٧ . واتە : ( بەندەی بەڕێزن و هەرگیز لە ووتوێژدا پێشی خوا ناکەون و بە فەرمانی ئەویش کار دەکەن ) . هەروەها دەفەرموێت : ﴿يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ﴾ الأنبياء: ٢٠ . واتە : ( فریشتەکان خۆیان بەگەورەنازان و لە پەرستنی خوادا هەرگیز بێ زارو بێ تاقەت نابن و بەشەو و ڕۆژ تەسبیحاتی خوا دەکەن و هەرگیز ساردنابنەوە ) .

## پ٧٦: چەند نمونەیەك لەو فریشتانە باس بکە بە پێی کارەکانیان ؟

و: فریشتەکان چەند جۆرێکن بەپێی کارەکانیان لەوانە :

هەیانە بەرپرسیارە لە گەیاندنی نیگا بۆ پێغەمبەران ( علیهم الصلاة و السلام ) ئەویش ناوی ( جوبرائیل ) ە . هەیانە بەرپرسیارە لە باران کە ناوی ( میکائیل )ە . هەیانە بەرپرسیارە لە فووکردن بە ( صور )دا کە ئەویش ناوی ( ئیسرافیل )ە . هەیانە بەرپرسیارە لە گیان کێشان کە ئەویش فریشتەی گیان کێشانە و چەند فریشتەیەکی بەردەستیشی هەیە بۆ هەمان کار . هەیانە بەرپرسیارە لە کارو باری مرۆڤەکان ئەویش فریشتە بەڕێزە نوسەرەکانن کە لەسەر شانی ڕاست و چەپی مرۆڤدان . هەیانە بەرپرسیارە بە پاراستنی بەندەکانی خوا لە پێشەوە و لە دواوە کە پێیان دەوترێت ( المعقبات ) هەیانە بەرپرسیارە لە بەهەشت و خۆشیەکانی ئەویش پێ دەوترێت ( رضوان )و ئەوانەی لەگەڵیدان .

هەیانە بەرپرسیارن لە دۆزەخ و سزای دۆزەخ ئەویش ( مالك )ە و ئەوانەی لەگەڵیدان کە ( ١٩ ) فریشتە لێپرسراویانن .

هەیانە بەپرسیارە لە پرسیاری قەبر ئەوانیش ( منكیر و نكیر )ن، هەیانە عەرشی خوایان هەلگرتووە .

هەیانە بەرپرسن لە نووسینی ئەو كارانەی مرۆڤ دەیكات لە كاتێكدا كە دلۆپە ئاوێكە و لە رحمی دایكیدایە.

فریشتە هەیە كە گەرۆكن و بەسەر كۆبوونەوەی زیكر و مەجلیسی خواناساندا دەگەرێن . هەیانە دەرۆنە ( مالی ئاوەدان كراو ) ( البیت المعمور ) كە رۆژانە حەفتا هەزار فریشتە دەرۆنە ئەو مالە ، هەیانە بەرێز وەستاون و لە زیكر و ویردی خوادان و بێ تاقەت و ماندوو نابن ، هەیانە لە سوجدە و ركوعدان بێ ئەوەی ماندوو بن ، بەم شێوەیە هەر فریشتەیەك كارێكی پێ سپێردراوە بێ ئەوەی دوا بكەوێت یان ماندوو بێت و كاری خۆی ئەنجام دەدات ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ المدثر: ٣١ . واتە : ( كەس نازانێت ژمارەی سەربازەكانی خوای گەورە چەندە ، خوا خۆی نەبێت و ئەو ژمارەیەش كە نۆزدەیە و باس كراوە بۆ یاد خستنەوەی مرۆڤەكانە ) .

**پ٧٧: بەلگەی ئیمان هێنان بە كتێبە ئاسمانی یەكان چی یە ؟**

و: بەلگە زۆرە لەوانە : ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنْزَلَ مِنْ قَبْلُ﴾ النساء: ١٣٦

واتە : ( ئەی ئیمانداران بڕواتان تازە بكەنەوە بە خوا و پێغەمبەری خوا و ئەو كتێبەی كە هێنراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەكەی(كە قورئانە)و ئەو كتێبانەی كەلەوەو پێشیش نێراونەتە خوارە وە ).

هەروەها فەرموویەتی ﴿ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ﴾ الشورى: ١٥ . واتە ( ئەی محمد بڵێ کە بڕوام هەیە بە هەموو ئەو کتێبانەی کە خوا ناردوویەتی یە خوارەوە ) .

**پ٧٨: ئایا هەموو کتێبە ئاسمانیەکان ناویان هاتووە لە قورئاندا ؟**

و: هەندێکی ناو براوە و دەست نیشان کراوە وەك ( قورئان ، تەورات ، ئینجیل ، زەبور ، صحفی ئیبراهیم و موسی ) ئەمانە پێویستە بڕوایان پێ بهێنین بەو شێوەیەی کە ناو براوە و بۆ کێ هاتۆتە خوارەوە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبْلُ ﴾ آل عمران: ٣ . واتە : ( خوا زاتێکە و جگە لەو خوایە خوای تر نی یە ، و ئەو هەمیشە زیندوو چاودێر و ئاگادارە ، ئەی محمد قورئان بەڕاستی و دروستی بۆ تۆ دابەزیوە و ڕاستی کتێبە پێشوەکان باس دەکات . هەروەها لەوە و پێش تەورات و ئینجیلی ناردووە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ ﴾ النساء: ١٦٣ . واتە : ( زەبورمان ناردۆتە خوارەوە بۆ داود پێغەمبەر ) .

لە قورئاندا ناوی پێغەمبەران هەیە هەر بەکورتی ناوی هێنراوە و ناوی کتێبەکەی نەبردووە ، ئەویش پێویستە هەر بڕوای پێ بکەین و بڕوامان هەبێت کە کتێبی تر نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەران وەك لە قورئاندا باسی هاتووە :

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ الحدید: ٢٥ . واتە : ( بێ گومان ئێمە پێغەمبەرانمان بۆ ناردوون هاوڕێ

لەگەڵ بەڵگەو نیشانە و معجیزەی جۆراو جۆر هەروەها کتێبی ئاسمانی و تەرازوو پێوەری شەرعیمان بۆ ناردوون تا خەڵکی بە عەدالەت و دادپەروەری ڕەفتار بکەن ).

## پ٧٩: مانای بڕواهێنان بەکتێبەکانی خوای گەورە چی یە ؟

و: مانای بڕواهێنانە لە دڵەوە و بەراست زانینی ئەوەی کە ئەو کتێبانە هەموو لە لایەن حواوە نێردراوە و فەرموودەی حەقیقەتی خوا خۆیەتی ، سەبارەت بە فەرمودەی خوا لەگەڵ پێغەمبەران ئەویش چەند جۆرێکە لەوانە :

١- هەیە خوای گەورە قسەی لەگەڵدا کردووە لە پشت پەردەوە : ﴿وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا﴾ النساء: ١٦٤ .

واتە : ( وە پێغەمبەرانێك کە پێشتر بۆمان باسکردویت وە پصێغەمبەرانێ کە چیرۆکیمان بۆ نەگێراویتەوە خوای گەورە وتووێژی ڕاستەخۆی لەپشت پەردەوە لەگەڵ موسا کردووە ) خوا دەربارەی تەورات دەفەرمووێ : ﴿وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾ الأعراف: ١٤٥ .

واتە : ( لە تابلۆکانی تەوراتدا هەموو بابەتێکمان بۆ تۆمار کردووە و ئامۆژگاری تێر و تەسەلی تێدایە ، ڕوون کردنەوەی هەموو شتێکمان بۆ نوسیووە ) .

٢- بەڵام هەندێك پێغەمبەر ( علیهم الصلاة و السلام ) خوای گەورە لە ڕێگەی فریشتەیەکەوە نیگای بۆ ناردووە و کتێبەکەی پێ گەیاندووە نمونەش ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ (١٩٣) عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ (١٩٥)﴾ الشعراء: ١٩٢-١٩٥ . واتە : ( بێ گومان ئەم قورئانە کەنێردراوی

خواییەو خولقێنەری هەموو دروست کراوەکانە و بە جوبرەئیلی ئەمیندا نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ ( واتە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی تۆ ببیتە یەکێ لە ترسێنەرانی خوایی بۆ مەردوم ، وە بەزمانی عەرەبی ئاشکرا و پاراو ناردوومانەتە خوارەوە ) وە هەیانە خوای گەورە بە دەستی خۆی نوسیویەتی وە بۆ هەرسێ شێوازەکەش خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ﴾الشورى: ٥١ . واتە : ( هیچ کەس بۆی نی یە خوا وتووێژی لەگەڵدا بکات مەگەر لەڕێگەی نیگاوە نەبێت یان لە پشتی پەردەوە یان نێراوێکی بۆ دەنێرێت کە بەگوێرەی فەرمان و مۆڵەتی خوا چی پێسپێردراوە دەیگەیەنێت ) .

## پ٨٠: پلەو پایەی قورئان چۆنە لەچاو کتێبەکانی تردا ؟

و: قورئان نیگا بان و شاهیە بەسەر کتێبەکانی ترەوە ، ڕاستی کتێبەکانی ترەوە ، ڕاستی کتێبەکانی تر دەسەلمێنێت. هیچ گۆڕانکاری و دەست کاریەکی ناکرێت ، حوکمی لابردن ئەدات بەسەر هەندێك لەو شتانەی کە لەوەو پێش لە کتێبەکاندا هاتووە و هەندێکی تریان جێگیر دەکات و دووپاتی دەکاتەوە لەبەرئەوە هەموو کەسێکی بڕوادار بەکتێبەکانی پێشوو ملکەچە بۆ قورئان و پابەند دەبێت پێوەی ، و قورئان کۆتا کتێبی خوایە وەك کتێبەکانی تر بوار نی یە کەس دەست کاری بکات و خوا پەیمانی داوە بە پاراستنی وەك دەفەرموێت : ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾ المائدة:٤٨ .

واتە : ( ئێمە قورئانمان بۆ ناردوون بەڕاستی و دروستی ، و ڕاستی کتێبەکانی پێش خۆی دووپات دەکاتەوە و نیگابانە بەسەر هەموویاندا ) .

هەروەها دەفەرمویت : ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾ الحجر: ٩ .واتە : ( بەڕاستی ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندووە و هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین ) .

**پ٨١: ئەرکی ئیمانداران بەرامبەر قورئان چی یە ؟**

و: شوێنکەوتنی قورئان لە ئاشکرا و پەنهانی دا ، و پابەند بوون بە داواکاریی یەکانی و هەستان بە فەرمانەکانی واجبە لەسەر ئیمانداران ، خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ الأنعام:١٥٥ . واتە : ( ئەم قورئانەمان ناردووەتە خوارەوە کە کتێبێکی بەفەڕە و شوێنی بکەون و خۆتان لە تاوان بپارێزن بەڵکو خوا ڕەحمتان پێ بکات ) .

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمویت : ( فخذوا بكتاب الله واستمسكوا به ) ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە. واتە : ( دەست بگرن بە قورئانەوە و پابەند بن پێوەی ).

**پ٨٢: مەبەست لە دەسگرتن بە قورئان و هەستان بە حەق دانی قورئان چی یە ؟**

و: لەبەرکردن و خوێندنەوەی و نوێژ کردن پێی لەشەو و ڕۆژ دا و بیر کردنەوە لە ئایەتەکانی و بە حەڵاڵ کردنی یان جێبەجێکردنی حەڵاڵەکان و دوور کەوتنەوە لە حەرامەکان ، ملکەچ بوون بۆ فەرمانکانی و خۆ بەدوورگرتن لە قەدەغە کراوەکانی و عیبرەت وەرگرتن لە نمونەکانی و پەند وەرگرتن لە چیرۆکەکانی و کارکردن بە ئایەتە موحکەمەکانی و تەسلیم بوون بەوەی کە لێمان تێکەڵ دەبێت[٨] و وەستان لەبەردەم سنورەکانیادا و بەرگری کردن لێی بەرامبەر ئەوانەی دەیانەوێت سوکایەتی پێ بکەن

---

[٨] مانای لامان شاردراوەیە

یان ماناکانی هەلگیرنەوە ، و ئامۆژگاری پێ کردنی و بانگەواز کردن لە بەلگەو چاو رۆشنی .

**پ٨٣: حوکمی ئەو کەسە چی یە کەبڕوای بە دروستکراوی قورئان هەبێت ؟**

و: قورئان فەرموودەی خوایە بە حەقیقەتی خۆی ووشەکانی و ماناکەشی فەرموودەی خوایە ، و هیچ کامیان لەوی تریان جیا ناکرێتەوە ، خوا خۆی ئەو ووتانەی فەرمووە ، و بەنیگا ناردوویەتی یە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ، وە موسڵمانان بە ڕاستی ئیمانیان پێ هێناوە ، قورئان فەرموودەی خوایە هەرچەندە بەدەست نوسراوەتەوە ، و بە زوبان دەوترێت و بە مێشك لەبەر دەكرێت ، و بەگوێ دەبیسترێت ، و بەچاو دەبینرێت ، زوبان و دەنگ دروستکراوی خوایە . بەلام ئەوەی کە دەخوێنرێتەوە لە قورئان دروستکراو نی یە سنگەکان دروستکراوی پەردەردگارن، و ئەوەی کە لەبەرکراوە و تیایا پارێزراوە لە قورئان دروست کراو نی یە ، گوێ دروستکراوە بەلام ئەوەی کە دەیبیستێت لە قورئان دروستکراو نی یە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴾ الواقعة: ٧٨ . واتە : ( ئەم قورئانە زۆر بەفەڕ و بەرێزە و لە کتێبێکی گەورە و رێز لێنراو دا کە ( لوح المحفوظ)ە پارێزراوە) . لە جێگایەکی تردا خوای کردگار دەفەرموێت : ﴿ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ العنكبوت: ٤٩ . واتە : ( ئەم قورئانەئایەتەکانی ڕوون و ئاشکران لە سینەوە دڵ و دەروونی ئەو کەسانەدایە کە زانست و عیلمیان پێ بەخشراوە و لەبەریانە و پارێزراوە ، بێ گومان جگە لە ستەمکاران کەس بەرهەڵستی و نکوڵی لە ئایەتەکانی خواناکات ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ﴾ الكهف: ٢٧ . واتە : ( بخوێنەوە لەو قورئانەی کە نیگا کراوەتە لات بە نیەتی

بەندایەتی و بانگەواز کردن هیچ کات کەس ناتوانێت ئەم قورئانە بگۆرێت یان بشێوێنێت یان لابدات ) . ئیبن مسعودیش دەڵێت : ( أديموا النظر في المصحف ) واتە: ( زۆر سەیری قورئان بکەن ) .

هەرکەسیش بڵێ قورئان دروست کراوە ئەوە پێی کافر دەبێت و کوفرێکی گەورەیە و خاوەنی ئەو قسەیە لە ئیسلام دەردەچێت ، چونکە قورئان فەرمودەی خوایە و لە خواوەیە و بۆ ئەویش دەگەرێتەوە ، ووتەی خواش سیفەتی خوایە ، وە هەرکەس بڵێت یەکێك لە سیفەتەکانی خوا دروست کراوە پێی کافر دەبێت و حوکمی پاشگەزبووی ( مرتد ) ی هەیە و داوای لێ دەکرێت کە تۆبە بکات و بگەرێتەوە بۆ ئیسلام ئەگەر سوور بوو لەسەر قسەی خۆی ئەوا دەبێت بکوژرێت بە کافری و هیچ حوکمێکی موسڵمانان نایگرێتەوە .

## پ ٨٤: ئایا سیفەتی قسەکردن ( خۆیی یە نایگرێتەوە ) خۆیی یان کرداریە ؟

و: قسەکردنی خوا بەپێی ئەوەی کە سیفەتی قسەکردن پەیوەستە بەزاتی خوا خۆیەوە بەیەکێك لە سیفەتە خۆییەکان دادەنرێت ، وەك عیلمی خوا ، و قسەکردنی خوا عیلمی خوایە و وە علمی ئەو نێراوەتە خوارەوە ، وە هەر خواش خۆ ی چاك دەزانێت چۆن دایبەزێنێت و بینێرێتە خوارەوە . بەڵام بە پێی ئەوەی کە قسەکردن بە ویستی خوا خۆیەتی و بە ئیرادەی خۆیەتی هەرکات بیەوێت و نەیەوێت دائەنرێت بەیەکێك لە سیفەتە کارییەکان هەر لەبەر ئەمەیە سەلەفی صالح خوایان لێ رازی بێت سیفەتی قسەکردنیان داناوە بە سیفەتێکی زاتی و کاریی ، خوای گەورە لەوەو پێش و بەردەوامیش قسەی کردووە و قسەدەکات و قسە کردنیشی بەویست و ئیرادەی خۆیەتی ، قسە دەکات ئەگەر بیەوێت .. و قسە کردنی خواش مەبەست و کۆتایی نی

یە وەك خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا﴾ الكهف: ١٠٩ . واتە : (پێیان بڵێ ئەگەر دەریاكان ببنە مەرەكەب و زانست و زانیاری پەروەردگاری پێ بنوسرێت ، دەریا تەواو دەبێت پێش ئەوەی زانیاری پەروەردگارم تەواو بێت ، نەك هەر ئەوەش ئەگەر چەندەها ئەوەندەی تریش دەریاش بهێنن و بیكەنە مرەكەب زانیاری خوا تەواو نابێت و بێ سنوورە ) .

هەروەها دەفەرمویت :﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ﴾ لقمان : ٢٧ . واتە : ( ئەگەر هەر چی درەختەكانی سەر زەوی هەیەببنە پێنوس و دەریاكانیش چەند هەیە ببنە حەوت ئەوەندە و ببنە مرەكەب زانست و نهێنیەكانی خوا بنوسنەوە قەڵەمەكان كول دەبن و مرەكەبەكەش تەوواو دەبێت بەڵام فەرموودە و زانیاری یەكانی خوا كۆتایی پێ نایەت ) .

## پ٨٥: وەستاوەكان ( الواقفە ) كێن و حوكمیان چی یە ؟

و: وەستاوەكان بریتین لەو تاقم و كەسانەی كە سەبارەت بە قورئان دەڵێن نە قسەی خوایەو نە دروسكراوی خوایە ، ئیمام ئەحمەد فەرموویەتی هەر كەسێك ئەم قسانە بكات زانیاری هەبێت ئەوا ( جهمی ) [٩] یە ئەو كەسەیش كە سادەو نەزان بێت

[٩] جهمیە : ئەو تاقمەن كە نەفی سیفەتەكانی خوا دەكەن و دەڵێن گوفتاری خوا دروست كراوە ، وەك دروست كراوەكانی تری و لەم بنچینەیەدا یەكن بەڵام لە تەفسیر و لێكۆڵینەوەیان بۆ ئەم بنەمایە چەندین گروپ و تاقمی تریان لێ پەیدا بووە ، وە ئەم گروپە دامەزراوە لە سەر دەستی جعدی كوڕی درهەم .

بەلگەی بۆ دەهێنرێتەوە و شتی بۆ ڕوون دەکرێتەوە تا تەوبە بکات و بڕوا بهێنێت کە قورئان قسەی خوایە ئەگەر تەوبەی نەکرد ئەوا خراپترە لە جەهمیەکان .

**پ٨٦: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە بلێت خوێندنەوەی قورئان دروست کراوە ؟**

**و:** ئەم ڕستەیە دروست نی یە نە دانی پێدا بنرێت و نە بەڕاست بزانرێت ، و دروستیش نی یە بەرپەرچ بدرێتەوە و بەناڕاستی بزانرێت ، لەبەر ئەوەی خوێندنەوەی قورئان مانایەکی هاوبەشە ،لە نێوان کاری خوێندنەوە کە چونکە ئەمەیان کاری مرۆڤە و لەنێوان ئەو شتەی کە دەخوێنرێتەوە کە ئەویش قورئانە لەم حالەتەدا گەر بووترێت خوێندنەوەی قورئان دروست کراوی خوایە ئەوا دەگەڕێتەوە سەر قسەی جەهمیەکان و ئەگەر بلێت دروست کراویش نی یە ئەوە بدعەیەکی داهێنراوە و ئەمەش ڕای پێشینە صالحەکانمانە .

**پ٨٧: بەلگەی ئیمان هێنان بە پێغەمبەران چی یە ؟**

**و:** بەلگەمان قورئان و سوننەتە ، لە قورئاندا ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡ﴾ النساء: ١٥٢ . واتە : ( ئەوانەی بڕوایان بە خواو پێغەمبەران هێناوە و هیچ جۆرە جیاوازیەکیان نەکردووە لە نێوانیاندا و بڕوایان بە هەمویان هەیە ئەوانە لە ئایندەدا پاداشتی خۆیان وەردەگرن ) . وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی سەبارەت بە بنەماکانی بڕواهێنان ( آمنت بالله ورسله ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( بڕوام هێنا بە خوا و گشت پێغەمبەران ) .

## پ٨٨: مانای بڕواهێنان بە پێغەمبەران چی یە ؟

و: بڕواهێنانێکی ڕاستە قینە بەوەی کە خوا بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکی ناردووە لە خۆیان ، تا بانگیان بکات بۆ لای پەرستنی خوای تاك و تەنها و واز هێنان لە هەرشتێك جگە لە خوا کە دەپەرسترێت ، و هەموو پێغەمبەران ڕاستگۆو بەڕاست زانراون ، چاك خواز و تێگەشتوون ، بەڕێز و هەڵبژێراوی خوان ، ڕێنمایی خەڵکیان کردووە ، خوا پەرست و دەست پاك بوون ، ئەوەی کە خوا پێی ڕاگەیاندوون هەموویان ڕاگەیاندووە بێ کەم و زیاد و هیچ شتێکیان نەشاردۆتەوە و هیچیان لێ نەگۆڕیوە ، وەك خوای میهرەبان دەفەرموێت : ﴿فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ النحل: ٣٥ . واتە (دەی ئایا پێغەمبەران هیچیان لەسەرە جگە لە ڕاگەیاندنێکی ئاشکرا).

پێغەمبەران لەسەر حەق و ڕاستی بوون و خوای گەورە پێغەمبەرانی کردووە بە خۆشەویستی خۆی وەمحمدی کردووە بە دۆستی خۆی و قسەی لەگەڵ موسی کردووە و پێغەمبەر ئیدریسی بەرز کردۆتەوە و پێغەمبەر(ﷺ)) عیسای هێناوەتە بوون بەبێ باوك و هەندێکیانی فەزڵ داوە بەسەر هەندێکی تریاندا .

## پ٨٩: ئایا بانگەوازی پێغەمبەران هەموویان یەك بانگەواز بوون ؟

و: بەڵێ بانگەوازی پێغەمبەران لەیەکەم پێغەمبەرەوە تا دوا پێغەمبەر ( علیهم الصلاة والسلام ) لەسەر بناغەو بنچینەی خواپەرستی دامەزراوە کە ئەویش یەکتا پەرستی یە ، بریتی یە لەوەی کە خوا بەتاك و تەنها بزانرێت لە هەموو کار و پەرستنێکدا بە بڕوا و کردار و گوفتارەوە ، پشت هەڵبکرێت لە هەر پەرستراوێکی تر لە پەرستراوەکان .

سەبارەت بە پێغەمبەر عیسی ( علیه الصلاة والسلام ) دەفەرموێت ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ﴾ المائدة: ٧٢ .

واتە : ( ئەی نەوەی ئیسرائیل خوا بپەرستن کە خوای من و ئێوەشە و ئەوەی شەریك بۆ خوا بڕیاربدات خوا بەهەشتی لێ حەرام دەکات و جێگەو ڕێگەی دۆزەخە)، سەبارەت بەپێغەمبەری خۆمان (ﷺ) دەفەرموێت : ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ ص: ٦٥ . واتە: ( ئەی محمد بڵێ کە من ترسێنەرم بۆ ئێوە و نێراوم کە پێتان ڕابگەیەنم هیچ خوایەك نی یە تەنها پەروەردگار نەبێت ، کە تاك و تەنها و بە چۆکا هێنەری تاوانبارانە ) ، بەم شێوەیە لە قورئانداباسی پێغەمبەران دەکات کە بانگەوازیان کردووە بۆ لای یەکتاپەرستی و بە تاك زانینی خوا .

## پ٩٠: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی بانگەوازی پێغەمبەران یەك بووە لە سەرچاوەی خوا پەرستیدا ؟

و: دوو جۆر بەڵگە هەیە گشتی و تایبەتی ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ النحل: ٣٦ . واتە : (لەهەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکمان ناردووە و پەیامێکمان پێدا ناردوون کە بە خەڵکی ڕابگەیەنن تەنها خوا بپەرستن و دوور بکەونەوە لە هەموو تاغوتێك ) . وە بە شێوەیەکی تایبەت وەك لە قورئاندا هاتووە هەر پێغەمبەرێك بانگەوازی میللەتەکەی دەکات بۆ یەکتا پەرستی ، نمونەش ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ﴾ المؤمنون: ٢٣ . واتە : ( پێغەمبەر (نوح) مان نارد بۆ لای

نەتەوەکەی و پێ ی ڕاگەیاندن کە تەنها خوا بپەرستن و جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکتان نی یە ) ، هەروەها سەبارەت بە پێغەمبەر (هود) دەفەرموێت :

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ﴾ هود: ٥٠ .

واتە : ( پێغەمبەر (هود)مان نارد بۆ نەتەوەی عاد و پێ ی ڕاگەیاندن کە تەنها خوا بپەرستن و جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی ترتان نی یە ) .

**پ٩١: بەڵگە چی یە لەسەر جیاوازی بەرنامەی پێغەمبەران لە مەسەلە فەرعیەکاندا ؟**

**و:** بەڵگەمان ئەم ئایەتەیە ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ﴾ المائدة: ٤٨ .

واتە : ( بۆ هەر لایەکتان واتە موسڵمانان و خاوەن کتێبە پێشووەکان بەرنامە و پرۆگرامی تایبەتمان بۆ ناردوون ، ئەگەر خوا بیویستایە هەر هەمووتانی دەکرد بەیەك ئوممەت ، بەڵام خوا تاقیتان دەکاتەوە بەوەی کەبۆی ناردوون دە پێشبڕکێ بکەن لە چاکەدا ) .

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت ( نحن معاشر الأنبياء أخوة لعلات ديننا واحد ) واتە : ( ئێمەی هۆزی پێغەمبەران براین ، بەڵام دایکمان جیایە و یەك ئاینمان هەیە ) ، مەبەست پێی یەکتا پەرستیە کە بنچینەی بانگەوازی هەموو پێغەمبەرانە و لە هەموو کتێبە نێراوەکاندا یاداشت کراوە ، بەڵام بەرنامە و شەریعەتەکانیان هەندێك جیاوازی تێدایە کە حەڵاڵ و حەرام و فەرمانەکان و قەدەغەکراوەکاندا ئەویش لەبەر حیکمەتێك کە خوای گەورەی تاك و تەنها ئاماژەی

پێ دەکات ﴿لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ﴾ الملك: ٢ . واتە : ( خوای تاك و تەنها تاقیتان دەکاتەوە تا دەری بخات کامتان کاری لە هەموان چاکترە ) .

**پ٩٢: ئایا خوای گەورە لە قورئاندا چیرۆکی هەموو پێغەمبەرانی بۆ باس کردووین؟**

**و:** ئەوەی کە پێویست بکات لە چیرۆکیان بۆمان باس کراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ﴾ النساء: ١٦٤ .

واتە : ( سەربردەی کۆمەڵێك پێغەمبەرمان بۆ باس کردویت و هی کۆمەڵێکە دیکەمان باس نەکردووە ) ، بۆیە ئێمە بڕوادەهێنین بەوەی کە ناویان هاتووە و ئەویش کە بە کورتی باسی لێوە کراوە ، گرنگ وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاریە لە چیرۆکە کانیان .

**پ٩٣: ناوی چەند پێغەمبەر هات لە قورئاندا ؟**

**و:** ناوی بیست و پێنج (٢٥) پێغەمبەر بەجیا ناو براوە ( ئادەم، نوح ، ئیدریس ، هود ، صالح ، ابراهیم ، ئیسماعیل ، ئیسحاق ، یەعقوب ، یوسف ، لوط ، شوعەیب ، یونس ، موسا ، هارون ، ئیلیاس ، زەکەریا ، یەحیا ، الیسع ، ذالکفل ، داود ، سولەیمان ، ئەیوب ، عیسا ، محمد و ناوی الاسباط بە کۆمەڵ براوە ) .

**پ٩٤: ( ألوالعزم )لە پێغەمبەراندا کامانەن ؟**

**و:** پێنج (٥) پێغەمبەرن بەڵگەشمان ئەم ئایەتەیە ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ﴾ الاحزاب: ٧ . واتە : ( لە کاتێکدا

پەیمانی گەیاندنی یەکتا پەرستی و بانگەوازمان لە پێغەمبەران وەرگرت ، پەیمانمان لە تۆ و نوح و ئیبراهیم و موسا و عیساش وەرگرتووە ) .

**پ٩٥: یەکەم پێغەمبەر کێ بوو ؟**

و: یەکەم پێغەمبەر پاش ئەوەی خیلاف دروستبووە نوح پێغەمبەر بووە ( علیه الصلاة و السلام ) خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ النساء: ١٦٣ . واتە : ( ئێمە نیگامان بۆ ناردوویت هەر چۆن نیگامان نارد بۆ نوح پێغەمبەر و پێغەمبەرانی دوای ئەویش ) .

**پ٩٦: ئیختلاف چ کاتێك ڕویداوە ؟**

و: ابن عباس دەڵێت : ( لە نێوان پێغەمبەر ئادەم و نوح دە سەدە خەڵکی ژیاوە کە هەموویان لەسەر یەك شەریعەت و بەرنامەی ڕاستی خوا بوون ، پاشان ئیختلافیان تێدا دروست بووە و لایان دا لە ڕێگەی ڕاست ) خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ البقرة: ٢١٣ .

واتە : ( خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە کە مژدە دەرین و ترسێنەر بن ) .

**پ٩٧: کێ کۆتا پێغەمبەرە ؟**

و: محمد کۆتا پێغەمبەرە و پاش ئەو پێغەمبەری تر نایەت .

**پ٩٨: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی کە محمد کۆتا پێغەمبەرە (ﷺ) ؟**

**و:** ئەم ئایەتە بەڵگەیە ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الاحزاب: ٤٠ .

واتە : ( محمد باوکی هیچ کەس لە ئێوە نییە بەڵکو پێغەمبەری خوایە و دواهەمین پێغەمبەریشە ) .

پێغەمبەریش بە علی کوڕی ئەبو تالیب ( خوای لێ ڕازی بێت ) دەفەرموێت : ( الا ترضى أن تكون بمنزلة هارون من موسى ألا أنه لا نبي بعدي ) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( ئایا ڕازی نابیت تۆ بۆ من وەك هارون وابیت بۆ موسا ، بەڵام فەرمانی خوایە و تازە پاش من پێغەمبەر نایەت ).

**پ٩٩: ( محمد ) بەچ شتێك تایبەت مەندبووە بەسەر پێغەمبەرانی تردا ؟**

**و:** پێغەمبەر (ﷺ) بە کۆمەڵێك سیفەت تایبەتمەند بووە کە لە پێغەمبەرانی تردا نەبووە ، لە فەرمودەیەکی صحیحدا هاتووە . ( أعطيت خمسا لم يعطهن أحد قبلي نصرت بالرعب مسيرة شهر وجعلت لي الارض مسجدا و طهورا وأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصل و أحلت لي الغنائم ولم يحل لأحد و أعطيت الشفاعة كان النبي يبعث الى قومه خاصة وبعثت الى الناس عامة ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( پێنج شتم پێ دراوە بەهیچ پێغەمبەرێك لە پێش منەوە نەدراوە ، سەرخراوم و پشتگیری کراوم بە ترس خستنە دڵی دوژمن لە دووری یەك مانگی زەویم بۆ کراوە بە جێگا سوجدە و خاوێن کەرەوە ، هەرکەسێکتان لە هەر شوێنێك بوو نوێژ هاتە پێشەوە با نوێژ بکات ، غەنیمەتی شەڕم بۆ حەڵاڵ کراوە کە بۆ کەسی تر لە پێش

منەوە حەڵاڵ نە بووە ، شەفاعەتی ڕۆژی دوایم پێ دراوە ، وە هەموو پێغەمبەرێك تەنها بۆ نەتەوەکەی خۆی نێردراوە تەنها من نەبێت نێردراوم بۆ هەموو خەڵکی بەگشتی ) .

**پ١٠٠: موعجیزەی پێغەمبەران چی یە ؟**

**و:** موعجیزە کارێکی بەدەر لە دەسەڵات و سنوری ئاسایی مرۆڤە کە کێ بەر کێ ناکرێت . موعجیزەش هەیە هەستی پێ دەکرێت بە چاو یان بە گوێ .. وەك دەرچوونی وشترەکەی پێغەمبەر ( صالح ) علیه السلام لە بەردەکە ، یان گۆچانەکەی پێغەمبەر ( موسی ) کە دەبوویە مار ، و قسەکردنی بێ گیانەکان ، یان موعجیزە مەعنەویە و بە عەقڵ هەستی پێ دەکرێت وەك ناردنی قورئان.

پێغەمبەر (ﷺ) لە هەردوو جۆرەکە موعجیزەی هەبووە ، لە وانەش : لەت بوونی مانگ ، و هاواری بنە دار خورماکە ، و دەرچوونی ئاو لە نێوان پەنجەی پێغەمبەردا (ﷺ) ، و قسە کردنی باسکی مەڕەکە کە زەهری پێوە کرابوو بۆی ، و تەسبیحاتی خواردن ، کە ئەمانە هەموویان فەرموودەی صەحیحیان لەسەرە ، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە چاوی خۆیان بینیویانن ، بەڵام لەگەڵ نەمانی کاتەکەیان موعجیزەکە نامێنێت و کاتیە و هەر بۆ ئەو سەردەمەیە ، بەڵام موعجیزەیەك بەردەوام بێت و نیشانە گرنگەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ چاکتر ڕوون بێتەوە موعجیزەی قورئانە کە هەموو عەقڵان و زانایانی سەرسام کردووە هیچ کەس و توانایەك ناتوانێت یەك ئایەت وەك قورئان دابنێت : ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ فصلت: ٤٢ .

واتە : ( هیچ ناحەقی و نادروستی و نا تەواویەکی تێدا بەدی ناکرێت لە هیچ لایەکەوە نەبە زیاد کردن و نە بەکەم کردن ، و بە هیچ ڕێگەیەك ناتوانرێت ڕەخنەیەکی تێدا بەدی بکرێت نێردراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و دانایی یە و شایەنی سوپاس و ستایشە ) .

**پ١٠١: بەلگەی معجیزە بوونی قورئان چی یە ؟**

**و: بەلگە لەسەر ئەوە قورئان لەماوەی ٢٣ساڵدا دابەزیوە و داوای لە هەموو کردووە کە لەوێنەی قورئان دابنێن .**

یەکەم جار داوای لێ کردن کە وێنەی قورئان بهێننەوە ﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴾ طور: ٣٤. واتە : ( ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن دەبا فەرمایشتێکی ئاوا وەك قورئان بهێنن ) .

پاشان داوای لێ کردن دە سورەت وەك قورئان بهێننەوە ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ﴾ هود: ١٣ .

واتە : ( بلێ ئەی محمد ئەگەر دەتوانن دە سورەتی وێنەی ئەم قورئانە بهێننەوە ئەگەر توانایان هەیە ) . پاشان توند تر بەرانبەریان وەستاو داوای یەك سورەتی لێ کردن ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ﴾ یونس: ٣٨ .

واتە : ( بلێ ئەی محمد ئەگەر ڕاست دەکەن ئێوەش یەك سورەت وەك قورئان دارێژن ) ، هەرچەندە هەوڵیان داو خۆیان کۆکردەوە و پشتگیری یەکتریان کرد نەیان توانی پاشان خوای گەورە ئاگاداری کردن کەنەیان توانی و پاشانیش ناتوانن ،

لەوێنەی قورئان دابنێن ، ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾ الأسراء: ۸۸ .

واتە : ( بڵێ ئەی محمد ئەگەر هەموو مرۆڤەکان و جنۆکەکان کۆببنەوە بۆ ئەوەی لە وێنەی ئەم قورئانە دا برێژن ناتوانن کاری وا بکەن هەرچەندە پشتگیر و هاوکاری یەکتریش بن ) .

## پ۱۰۲: بەڵگەی ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی چی یە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴾ النساء : ۱۳٦ واتە : ( ئەوەی بێ بڕوابێت بە خواو فریشتەکان و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی ، ئەوە گومڕابووە و تووشی سەر لێشێوانێکی خراپ هاتووە ) ، پێغەمبەریش (ﷺ) لە کاتێکدا جوبرئیل پرسیاری لێ کرد سەبارەت بە ئیمان فەرمووی : ( أن تؤمن بالله و ملائکته و کتبه ورسله والیوم الآخر و تؤمن بالقدر خیره وشره ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( ئیمان ئەوەیە کە بڕوات هەبێت بە خواو فریشتەکان و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و قەدەر بە ( خێر و شەڕیەوە ) .

## پ۱۰۳: مەبەست لە ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی چی یە و چی دەگرێتەوە ؟

و: مەبەست پێی بڕواهێنانێکی یەقینی یە کە ڕۆژی قیامەت هەیە و دێتە پێشەوە و ڕوو دەدات و بڕواهێنانیش بە قیامەت ، بڕواهێنان بە نیشانەکانی نزیک بوونەوەی قیامەت ، نیشانە بچوکەکان و گەورەکان دەگرێتەوە ، هەروەها بڕواهێنان بە بونی سزای قەبر و خۆشی و ناخۆشیەکان ، ماوەی بەرزەخ و فو کردن بە صوردا و هاتنە

دەرەوەی مرۆڤەکان لە لە گۆڕکانیان و وەستان بۆ چاوەڕێ کردنی حوکمی خوا و بڵا و کردنەوەی نامەکان و دانانی تەرازوو هەموو ئەمانە دەگرێتەوە ، پێویستە بڕوامان پێیان هەبێت و لەهەمان کاتیشدا هەندێك شتی تریش هەیە کە لە قورئاندا یان لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە لە قیامەتدا هەیە دەبێت بڕوای پێ بهێنین وەك بوونی پردی(سراط)و بوونی حەوزی کەسەر و شەفاعەت و دۆزەخ و بەهەشت و سەیرکردنی ڕووی خوا و موحاسەبە کردن .. هتد ، ئەمانە دەبێت بڕوای تەواومان بەبونیان و بینینیان هەبێت .

**پ١٠٤: ئایا کەس دەزانێت قیامەت کەی ڕوودەدات ؟**

**و:** هاتنی قیامەت یەکێکە لە زانیاریە غەیبی یەکان کە خوا لە لای خۆی هێشتویەتی یە وە وە هیچ یەکێك لە دروست کراوەکانی نایزانێت وەك لە قورئاندا باسی کردووە :

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ﴾ الأعراف: ١٨٧ .

واتە : ( ئەی محمد پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی کاتی بەرپابوونی قیامەت تۆش بڵێ ئەو زانیاری یە تەنها لە لای خوایە و کەس لێ ی بە ئاگا نی یە و ئاشکراشی ناکات بۆ کەس و تەنها لە لای خۆیەتی و قیامەتیش زۆر گرانە لەسەر ئاسمانەکان و زەوی و هاتنەکەشی بە کوتولە ناکاوە) .

پێغەمبەریش (ﷺ) لە کاتێکدا جوبرئیل لێی پرسی کە کەی قیامەت ڕوودەدات ، ئەویش فەرمووی ( ما المسؤل عنها بأعلم من السائل ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( ئەوەی پرسیاری لێ کراوە شارەزاتر نی یە لەوەی کە پرسیار دەکات ).

**پ١٠٥: نمونە نیشانەکانی قیامەت لە قورئاندا کامەیە ؟**

**و: نمونە زۆرن لەوانەش لە قورئاندا باس کراوە**

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا﴾ الأنعام: ١٥٨ .

واتە : ( با بێ بڕوایان چاوەڕێ بن و بزانن کە لە قیامەتدا هەڵوێستیان چی دەبێت کاتێك فریشتەکان یان خوای گەورە خۆی دێتە لایان بۆ موحاسەبە کردن و سزادانیان یان چاوەڕوانی هاتنی هەندێك لە نیشانەکانی قیامەت دەکەن ، هیچ نەفسێك ئیمان سوودی پێ ناگەیەنێت ، ئەگەر لەپێش لەو کاتەدائیمانی نەهێنابێت یان کردەوەی چاکی هاوڕێ لەگەڵ ئیمانەکەیدا ئەنجام نەدابێت ) .

﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ النمل: ٨٢ . واتە : ( کاتێك بڕیاری بەرپابوونی قیامەت درا و کاتەکەی نزیك بوویەوە زیندەوەرێك لە زەوی دەردەهێنین قسەیان لەگەڵدا بکات و ئاگاداریان بکاتەوە کە زۆربەی خەڵکی بڕوایان بە بەڵگەکانی گەورەیی خوا نەبووە ) .

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴾ الأنبياء: ٩٦

واتە : ( (دونیا بەردەوام دەبێت تا ئەو کاتەی) تیرەی یەئجوج و مەئجوج بەربەستەکەی ( ذوالقرنین) یان بۆ دەکرێتەوە و دێنە دەرەوە و ئەو کاتە لەهەموو بەرزایەکەوە لێشاو دێن و پەیدا دەبن و بە خێرای دەڕۆن بۆ بەرپاکردنی خراپە ) .

﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾ الدخان: ١٠ .

واتە : ( چاوەڕێ بکەن ڕۆژێك دووکەڵێکی ئاشکرا بەردەم ئاسمان دەگرێت )

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ﴾ الحج: ١ .

واتە : ( ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن و بزانن بومەلەرزەی ڕۆژی قیامەت زۆر ترسناك و گەورەیە ) .

ئەو فەرموودانەی کە لەسەر هاتنە دەرەوەی یەئجوج و مەئجوج و دەرکەوتنی دوکەڵ و هەڵکردنی ئەو نەسیمە نەرمەی دەبێتە هۆی مردنی موسڵمانان و دەرکەوتنی ئاگر و نقوم بوون لەزەویدا . ئەو فەرموودانەش ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوون ، وەك : ( لاتقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( قیامەت هەڵناستێت تا ڕۆژ لە ڕۆژئاوا هەڵنەیەت ) .

**پ١٠٦: نمونەی نیشانەکانی قیامەت لە سوننەتدا کامەیە ؟**

و: هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە و دەرکەوتنی دەجال و دابەزینی ( عسی ) پێغەمبەر علیه السلام و جەنگە گەورەکان هاتووە .

**پ١٠٧: بەڵگە چی یە لەسەر بڕواهێنان بە مردن ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ آل عمران: ١٨٥ .

واتە : ( هەموو نەفسێك دەبێت بمرێت و نارەحەتی مردن بچێژێتو تەنها لە قیامەتدا پاداشت و حەقی خۆتان بەتەواوی وەردەگرن )

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَـٰلِدُونَ﴾ الأنبياء: ٣٤ .

واتە : ( ئێمە پێش تۆ ژیانی هەمیشەیمان بەکەس نەبەخشیوە ، ئایا ئەگەر تۆ بمری ئەو خەڵکە ژیانی هەمیشەیی دەباتە سەر ؟! ) .

﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ الزمر: ٣٠ .

واتە : ( ئەی محمد تۆ سەرئەنجام دەمریت و ئەوانیش دەمرن ) .

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموودەی هەیە لەسەر مردن جگە لەوەش مەسەلەی مردن ڕووداوێکە هەموو کەسێك دەیبینێت و هەستی پێ دەکات و یەقینی هەیە کەدێت بەسەر خۆیدا بەڵام بڕوا نەهێنان بە مردن و ڕووداوەکانی تەنها پیشەی کەسانێکە کەخۆیان بە گەورە دەگرن و دژایەتی ئیسلام دەکەن ، وە دەبێت بڕوامان وابێت کە هەر شتێك دەمرێت یان دەکوژرێت بەهەر هۆیەکەوە بێت ، ئەجەلی خۆی هاتووە و هیچ کات زیاد ناڕوات و کەم ناکات و خوا کاتێکە دیاری کردووە و لەو کاتەدا گیان لەدەست دەدات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ الرعد:٢.

واتە : ( هەموو شتێك بێ وچان لەکاری خۆیدایە تاکاتی دیاری کراوی خۆی )

وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ الأعراف: ٣٤ .

واتە:( نەتەوەکان یان مرۆڤەکان تەمەنتان سنوردارە هەرکاتێك ڕۆژیان تەواو بوو ساتێك دواناخرێت ) .

**پ١٠٨: بەڵگە چی یە لە قورئاندا لەسەر سزای قەبر و بوونی خۆشی و ناخۆشی لەقەبردا ؟**

**و:** بەڵگەمان ئەم چەند ئایەتەیە کە خوا دەفەرموویت : ﴿كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ المؤمنون: ١٠٠ .

واتە :( نەخێر ئەوە قسەیەکەو ئەو بۆ خۆی دەیڵێت دەبێت چاوەڕێ بێت لە جیهانی بەرزەخ تا کاتی زیندوو بوونەوە) ،﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾ غافر: ٤٦

واتە : ( دارو دەستەی فیرعەون توشی سزایەکی سەخت دەبن ، ئاگری دۆزەخ بەیانیان و ئێواران نیشانیان دەدرێت (ئەمە لە کاتی مردن تا کاتی زیندوو بونەوە) وە کاتێك قیامەت هەڵدەستێت فەرمان دەدرێت کە دەستە و تاقمی فیرعەون بخەنە خراپترین سزاوە ) .

﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ابراهيم: ٢٧ واتە : ( بێ گومان خوای گەورە ئیمانداران پایەدار و جێگیر دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و ڕاست لە ژیانی دونیادا و لەسەرەمەرگ و قیامەتدا ).

**پ١٠٩: بەڵگەی بوونی سزای قەبر وە بوونی خۆشی و ناخۆشی لە سوننەتدا چی یە ؟**

**و:** لەسەربوونی سزاو خۆشی قەبر زیاتر لە شەست فەرموودەی صەحیح هەیە کە دڵنیایی و یەقین دروست دەکات کە لە قەبردا موسڵمان خۆشی دەبینێت و تێیدا

دەژی تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە ، لەو فەرموودانەش : (إن أحدكم إذا مات عرض عليه مقعده بالغداة والعشي إن كان من أهل الجنة ، وإن كان من أهل النار فمن أهل النار يقال هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( بێ گومان ئەگەر یەکێکتان مرد ئەوا شوێنی خۆی لە قیامەتدا بەیانیان و ئێواران نیشان دەدرێت ئەگەر لە بەهەشتیەکان بوو ئەوا بەهەشتی نیشان دەدرێت ئەگەر لە دۆزەخیەکان بوو دۆزەخی نیشان دەدرێت پێی دەوترێت ئەوە شوێنەکەتە تا خوا زیندووت دەکاتەوە لە قیامەتدا ) هەروەها جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆشتە دەرەوە لە کاتێکدا خۆر ئاوا بوو بوو دەنگێکی بیست فەرمووی : ( يهود تعذب في قبورها ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( ئەوە دەنگی جولەکەیەو لە گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت ) .

## پ١١٠: بەڵگەی زیندوو بوونەوە چی یە لە گۆڕەکان ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ ﴾ الحج: ٧ .

واتە : ( دڵنیا بن خوا زاتێکە حەقە و بێ گومان زۆر بەئاسانی مردوان زیندوو دەکاتەوە ، و پەروەردگار دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە قیامەتیش هەر بەرپا دەبێت و هیچ گومانێکیش لەوەدا نی یە و خوای گەورەش ئەوانەی لە ناو گۆڕەکان دان هەموویان زیندوو دەکاتەوە و دەیان هێنێتە دەرەوە .

﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ﴿٧٨﴾ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ﴾ يس: ٧٧-٧٩ .

واتە : ( ئایا ئادەمیزاد نابینێ کە ئێمە دروستمان کردووە لە قەترە ئاوێکی قێزەون کەچی دەبێتە دوژمنێکی ئاشکرا و دژایەتیمان دەکات نمونەمان بۆ دێنێتەوە و دروست کردنی خۆی لەیاد چووە ، دەڵێت کێ ئەم ئێسقانانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا پواوە ، ئەی محمد تۆش بڵێ ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە یەکەم جار خولقاندوویەتی کە هەر بوونی نەبووە بەڵام دروستی کردوون ) .

**پ١١١: حوکمی ئەو کەسەی زیندووبونەوە بە درۆ دەزانێت چی یە ؟**

**و:** ئەو کەسە کافرە بە خواو بە کتێبەکانی خواو پێغەمبەران و لە ئیسلام دەرچووە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾ التغابن: ٧ .

واتە : ( ئەوانەی کافر و بێ بڕوان وا گومان دەبەن هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە پێیان بڵێ وانی یە و سوێند بە پەروەردگارم زیندوو دەکرێنەوە پاشان ئاگادار دەکرێنەوە لە هەر کار و گوفتارێك بە ئەنجامیان گەیاندووە و ئەوەش لە لای خوا زۆر ئاسانە ) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : لە فەرموودەیەکی قودسیدا خوای باڵا دەست دەفەرموێت : ( كذبني ابن آدم ولم يكن له ذلك وشتمني ولم يكن له ذلك فأما تكذيبه اياي فقوله لن يعيدني كما بدأني وليس أول الخلق بأهون على من إعادته و أما شتمه إياي فقوله إتخذ الله ولدا ، و أنا الاحد الصمد لم ألد ولم أولد ولم يكن لي كفواً احد) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( نەوەی ئادەم بە درۆی خستمەوە کە بۆی

نی یە ئەوە بکات ، وە قسەی پێ ووتووم کە بۆی نی یە ئەوە بکات ، بە درۆ خستنەوەم ئەوەیە کە مرۆڤەکان دەڵێن خوا دەستەلاتی نی یە ئێمە زیندوو بکاتەوە بەو جۆرەی کە دروست بووین بەمەرجێك زیندوو کردنەوەیان ئاسانترە لە دروست کردن لە کاتێکدا هیچ بوونیان نەبووە ، وە قسە پێووتنیشم ئەوەیە کە من کورم هەبێت ، من تاك و تەنهام ، نە لە کەس بووم و نە کەسیشم لێ بووە . وە هیچ هاو شێوە و هاوتاو هاو وێنەم نییە نە لە زات و نە لە سیفاتدا ) .

**پ١١٢: بەڵگەی فوکردن بە کەرِنا ( صور )دا چی یە و چەند جار فوی پێدا دەکرێت ؟**

**و:** دوو فووکردن هەیە بە صوردا و فوکردنی یەکەم بۆ لەناو چوونی مرۆڤەکانە و فوکردنی دووەم بۆ زیندوو بونەوەیە ، وەك لە قورئاندا هاتووە : ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ الزمر: ٦٨ .

واتە : ( کاتێك فودەکرێت بە صوردا هەرچی لە ئاسمانەکان و گۆی زەویدا بێت دەست بەجێ دەمرێت مەگەر بۆ ئەوەی خوا خۆی ویستی لەسەر نەبێت ، لەپاشان فوویەکی تری پێدا دەکرێتەوە هەر هەموو مردووان زیندوو دەبنەوە و دەست بەجێ بە پێوەن و چاوەرێن ) .

هەروەها لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر دەفەرموێت : ( ثم ينفخ في الصور فلا يسمعه أحد الا أصغى ليتا ورفع ليتا قال و أول من يسمعه رجل يلوط حوض ابله قال فيصعق ويصعق الناس ، ثم يرسل الله أو قال : ينزل الله مطرا كأنه الطل أو قال الظل (شعبة الشاك) فتنبت منه أجاد الناس ثم ينفخ فيه اخرى فإذاهم قيام ينظرون ) ئیمام موسلیم ریوایەتی کردووە . واتە : ( لە پاشاندا فودەکرێت بە

کەرەنادا هەر کەس گوێ ی لێبێت لاملی خوار دەکاتەوە بەرزی دەکاتوە وە فەرمووی یەکەم کەسێك کە گوێ ی لێدەبێت گۆلە ئاوی وشترەکانی چاك دەکات ، ئەو دەمرێت و هەموو خەلکیش دەمرن پاشان خوای گەورە بارانێك دەنێرێت لە وێنەی سێبەرە یان لە وێنەی ئەو بارانەیە کە لە رۆژێکی هەتاودا دەبارێت ، بەو بارانە لەشە بەهێزەکانی خەلکی دەرویتەوە ، لە پاشاندا جارێکی تر فوو دەکرێتەوە بە کەرەنادا هەموو مەردوم بە پێوە رادەوەستن و چاویان ئەبلەق بووە ) .

## پ۱۱۳: سیفەتی حەشر[10] چۆنە لە قورئاندا ؟

و: سیفەت و باسی مەحشەر زۆر و جۆرا و جۆرە لە قورئاندا نمونەش : ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ الأنعام: ٩٤ ؛

واتە : ( بە تاك و تەنهایە گەرانەوە بۆ لامان هەر چۆن یەکەم جار بە تاك و روت و قوتی دروستمان کردوون ) .

﴿وَحَشَرْنَاهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾ الكهف: ٤٧ . واتە : ( هەموو مرۆڤەکان کۆدەکەینەوە بۆ حەشر و کەسیان بەجێ ناهێڵین ) .

﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾﴾ مريم: ٨٥-٨٦ .

واتە : ( رۆژێك دێت کە بە سواری خواناسان بۆ لای خوا بەرێ دەکەون و تاوان باران و خراپەکارانیش بە پەلەو تینویەتی راودەنێین بۆ ناو دۆزەخ ) .

[10] ( حشر ) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای کۆکردنەوە و پێکەوەنان دێت . وە ( یوم الحشر ) بریتی یە لە رۆژی کۆکردنەوەو کۆمەڵ بوونی خەلکی و پێکەوە نانیان لە شوێنێکدا .

﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴾ طه: ١٠٨ . واتە : (لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵکی شوێن جاڕدەری لای خوا دەکەون و کەس ناتوانێت سەرپێچی بکات هەموو خەڵکی لە ترسی خوا بە نزمی قسە دەکەن و تەنها چرپە چرپ نەبێت هیچ نابیستیت ) .

﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ﴾ الأسراء: ٩٧ . واتە : ( ئەو جۆرە کەسانەی خوا نەناس بوون لە قیامەتدا لەسەر ڕووخساریان حەشر دەکرێن و بەرە و دۆزەخ دەبرێن ) .

## پ١١٤: سیفەتی حەشر لە سوننەتدا چۆنە ؟

و: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( يحشر الناس على ثلاث طرائق راغبين راهبين واثنان على بعير ، و ثلاثة على بعير وعشرة على بعير ونحشر بغيتهم النار تقيل معهم حيث قالوا ، تقيل معهم حيث قالوا وتصبح معهم حيث أصبحوا وتمسى معهم حيث أمسوا ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( خەڵکی ڕاپێچ ئەکرێن بۆ ساحەی مەحشر لەسەر سێ شێواز بە خۆشی و ناخۆشیەوە هەیانە دوو دوو لەسەر ووشترێك ، یان سێ سێ لەسەر ووشترێك یان چوار چوار لەسەر ووشترێك یان دە دە لەسەر ووشترێك ، ئەوانی تریان ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو ئاگر ، لەگەڵ پاڵ کەوتن و ئیسراحەتدا لەگەڵیاندایە بەیانی دەکەنەوە یان ئێوارە دەکەنەوە ئاگر لە گەڵیاندا یە و لێیان نا برێت یان لێیان دوورناکەویتەوە ) .

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە : ( أن رجلا قال يا نبي الله كيف يحشر الكافر على وجه ؟ ، قال : اليس الذى امشاه على الرجلين فى الدنيا قادرا على أن يمشيه على وجه يوم القيامة ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( پیاوێك

ووتی بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەی پێغەمبەری خوا چۆن بێ بڕوایان لە قیامەتدا لەسەر ڕوو حەشر دەکرێن ، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی ئایا ئەوەی توانای داوەتێ کە لەسەر پێیەکانی بڕوات لە دونیادا بەتواناشە کە وای لێ بکات لەسەر مووی چاوی بڕوات و ڕێبکات ) ، لەفەرموودەیەکی دیکەشدا هاتەووە : ( إنكم محشورون حفاة عراة غرلا كما بدأنا أول خلق نعيده أن أول الخلائق يكسى يوم القيامة ابراهيم ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( ئێوە حەشر دەکرێن بەپێ ی پەتی و بەڕوت و قوتی و بەخەتەنەکراوی ، هەرچۆن یەکەم جار دروستمان کردوون زیندووتان دەکەینەوە یەکەم دروست کرا و کەپۆشتە بکرێت پێغەمبەر ابراهیمە (عليه الصلاة والسلام ) ) .

لەسەر فەرموودەی سەرەوە عائیشە لە پێغەمبەر (ﷺ) دەپرسێ ( يا رسول الله الرجال والنساء ينظر بعضهم الى بعض ؟! فقال ( الامر اشد من أن يهمهم ذلك ) ) . ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا لە کاتێکدا پیاو ژن ڕووتن سەیری یەکتر ناکەن ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( ناڕەحەتی یەکە زۆر لەوە قورس و گرانترە کە بایەخ بەوە بدەن ) .

**پ١١٥: ئایا وێستگە ( الموقف ) چۆن باس کراوە لە قورئاندا ؟**

و: وێستگە بریتی یە لە کاتی چاوەڕێ کردن پێش دەست کردن بە موحاسەبە و پاش زیندووبونەوە ، خوای خاوەن شکۆ دەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾﴾ ابراهيم: ٤٢-٤٣.

واتە : (ئەی ئیمانداران وا گومان مەبەن خوا بێ ئاگایە لە کارو کردەوەی ستەمکاران، بەڵکو تۆڵە سەندن لەوانە دوا دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانیان ئەبڵەق دەبێت و بە پەلە و شپرزەیی دێن و سەریان بەرز کردۆتەوە ، چاویان ئەبڵەقە و ناتروکێنن و دڵەڕاوکێیانە و دڵ و دەروونیان بەتاڵە و هیچ حاڵی نابن ) ، لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت : ﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾ النبأ: ٣٨ . واتە : ( ڕۆژێك دێت کە جوبرەئیل و فریشتەکان بەڕیز دەوەستن و ورتەیان لێوە نایەت و هیچ قسەناکەن مەگەر ئەوەیان کە خوای گەورە مۆڵەتی بدات و قسەی چاك و بەجێ بکات ) ، لە ئایەتێکی دیکەشدا دەفەرموێت : ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ غافر: ١٨ ، واتە : ( ئەی محمد بیان ترسێنەو بە ئاگایان بێنە لەو ڕۆژە نزیکەی کە ڕۆژی قیامەتەو دڵەکان لە ترسان دەگەنە گەرویان و غەمگین و پەست و نارەحەتن ئەو کاتە ستەمکاران هیچ دۆست و پشتیوانێکیان نی یە ) .

لە شوێنێکی دیکەی قورئاندا فەرموویەتی : ﴿فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ المعارج: ٤ . واتە : ( لە ڕۆژێکدا کەماوەکەی پەنجا هەزارساڵ دەخایەنێت ) .

یان دەفەرموێت : ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾ الرحمن: ٣١ . واتە : ( ئەی گرۆی جنۆکە و ئادەمیزاد بێ گومان بن بەم نزیکانە لێتان دەپرسینەوە و دادگایتان دەکەین ) .

## پ١١٦ : سیفەتی موقف لە سوننەتدا چۆنە باس کراوە ؟

و: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( يغرق أحدهم في رشحه الى انصاف أذنيه ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( هی وایان هەیە لە عارەقی خۆیدا

جەستەی دادەپۆشێ تا دەگاتە گوێکانی ) هەروەها دەفەرموێت : ( يعرق الناس يوم القيامة حتى يذهب عرقهم في الأرض سبعين ذراعا ويلجمهم حتى يبلغ آذانهم ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( خەڵکی عارەق دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا هەتا عەرەقەکەیان حەفتا باڵ دەڕواتە ناخی زەوی یە وە و ڕۆ دەچێ و پاشان ئاستی عارەقەکەیان بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە گوێ کانیان ) .

## پ۱۱۷: سیفەتی پیشاندان ( عرض ) و حیساب لە قورئاندا چۆنە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ الحاقة: ۱۸ .

واتە : ( ئەو ڕۆژە دەبرێن بۆ بەردەم دادگای حەق و کارەکانتان پیشان دەدرێت و هیچ شتێك لە نهێنی و شاراوەکانتان بە پەنهانی نامێننەوە ) .

﴿وَعُرِضُوا عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ الكهف: ٤٨ ، واتە : ( ئەوان ڕیز دەکرێن و دەهێنرێنە بەردەم پەروەردگار خواش پێیان دەفەرموێت گەڕانەوە بۆ لامان بەڕووت و قووتی و بەتاك و تەنها هەروەك چۆن لەیەکەم جاردا دروستمان کردن ) .

## پ۱۱۸: ئایا سیفەتی پیشاندان ( عرض )[11] و حیساب لە سوننەتدا چۆنە ؟

و: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : ( يجاء بالكافر يوم القيامة فيقال له أرأيت لو كان لك ملأ الأرض ذهبا كنت تفتدى به ؟ فيقول نعم : فيقال : قد سئلت ماهو أيسر من ذلك أن لا تشرك بي فأبيت الا الشرك ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

---

[11] (عرض) : بە دوو مانا هاتووە : یەکێکیان گشتی یە بریتی یە لە پیشاندان و ئاشکرا کردنی نامەی کردەوەکان و دروستکراوەکان بۆ خۆیان ، هیچ شاراوەیەك نامێنێت ئەمە بۆ ئەوانەیە کە گفتو گۆیان لەگەڵ بکرێت و ئەوانەش کە گفتوگۆیان لەگەڵ ناکرێت – مانای دووەم بریتی یە لە پیشاندانی تاوانی ئیمانداران و پاشان داپۆشینی و لێخۆشبوونیان .

واتە : ( كافر دەهێنرێت لە قیامەتدا و پێی دەوترێت ئایا ئەگەر بە كێشی زەوی ئاڵتونت هەبوایە دەت بەخشی بۆ ئەوی رزگارت ببوایە دەڵێت بەڵێ ، پێی دەوترێت : لەوە ئاسانترت داوات لێ كرا كە ئەویش ئەوەیە شەریك بۆ خوا قەرار نەدەیت بەلام هەر سەركەشیت كردوو شەریكت بۆ خوا قەراردا ) .

هەروەها دەفەرموێت : ( ما منكم من أحد الا سيكلمه ربه ليس بينه و بينه ترجمان فينظر أيمن منه فلا يري الا ما قدم من عمله وينظر أشأم منه فلا يرى الا ما قدم ، وينظر بين يديه فلا يرى الا النار تلقاء وجهه فاتقوا النار ولو بشق تمرة ولو بكلمة طيبة ) ئیمام بوخاری وموسلیم ریوایەتیان كردووە . واتە : ( هەریەكێك لە ئێوە خوا قسەی لەگەڵ دەكات و لە نێوان خواو ئێوەدا ترجمان نی یە ، ئەو كەسە سەیری لای راستی دەكات هیچ نابینێت تەنها ئەوە نەبێت كە كردوویەتی و پێشی خستووە بۆ قیامەت ، و سەیری لای چەپی دەكات هەر ئەوە دەبینێ كە ئەنجامی داوە ،و سەیری بەردەمی دەكات ئاگر دەبینێ ، بەرەو رووی دێت خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە لەتە خورمایەكیش بێت یان بە وتەیەكی شیرین ) .

## پ١١٩: ئایا سیفەتی بڵاو كردنەوەی نامەی كردەوەكان چۆنە لە قورئاندا ؟

و: خوای بەخشندە دەفەرموێت : ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾ الأسراء: ١٣-١٤ .

واتە : ( نامەی كردەوەی هەركەس هەڵئەواسین بە گەردنیانەوە لە رۆژی قیامەتیشدا كارنامەی كردەوەكانی دەخەینە بەردەست بە كراوەیی و ئاشكرا ئەو كات پێ ی

دەوترێت نامەی کردەوەکانت بخوێنەوەو تەماشای بکە ئیتر خۆت بڕیار بدە بەسەر خۆت و تەنها خۆت بەسە بڕیاردەر بیت بەسەر خۆتەوە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ﴾ التكوير : ١٠ . واتە : ( کاتێك کە نامەی کردەوەکان والا دەکرێن ) ، ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَاۚ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا﴾ الكهف: ٤٩ . واتە : ( نامەی کردەوەکان دادەنرێ دەبینن بێ بڕوایان دڵە ڕاوکێیانە و دەڵێن هاوار لە ئێمە ئەم نامەو دۆسیە یە چی یە هەرچی وورد و درشتە کە کردومانە تۆماری کردووە ، هەرچیان کردووە بە تۆمار کراوی ئامادەیە و خوای گەورە ستەم لەکەس ناکات ) .

**پ١٢٠: بەڵگەی بڵاو کردنەوەی نامەکان چی یە لە سوننەتدا ؟**

و: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( يدنى المؤمن من ربه حتى يضع عليه كنفه فيقرره بذنوبه تعرف ذنب كذا ؟ يقول : أعرف يقول رب أعرف مرتين ، فيقول سترتها في الدنيا وأغفرها لك اليوم ثم تطوى صحيفة حسناته وأما الآخرون أو الكفار فينادي عليهم على رؤوس الأشهاد. ﴿هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ هود: ١٨ . واتە : ( ئیماندار لە خوا نزیك دەکرێتەوە هەتا دەچێتە پاڵی و ئیعترافی پێ دەکات بە تاوانەکانی پێ ی دەڵێت ئەو گوناهەت دەزانیت ؟ ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

ئەویش دەڵێت بەڵێ : دووجار دەڵێت بەڵێ خوایە دەیزانم ، خوای گەورەش دەفەرموێت لە دوونیادا بۆم داپۆشیت و لە قیامەتیشدا لێت دەبورم ، پاشان نامەی

چاکەکانی دەپێچرێتەوە ، بەڵام ئەوانەی بێ بڕوان لەبەردەم هەموو مرۆڤەکاندا جاڕیان دەدرێت و ئاشکرا دەکرێن کە ئەوانە بوون درۆیان بەدەم خواوە هەڵدەبەست) .

**پ١٢١: بەڵگەی تەرازوو چی یە لە قورئاندا و شێوازی کێشانە لە قیامەتدا چۆنە ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ الأنبياء:٤٧ . واتە : ( ئێمە تەرازووی ڕاست و دروست لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین وە هیچ کەسێك ستەمی لێ ناکرێت ئەگەر بەقەدەر تۆوە خەرتەلەیەك چاکە یان خراپەی هەبێت دەیخەینە ڕوو وتەنها ئێمەش بەسین بۆ ئەوە بە ووردی حساب بکەین ) .

﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ۚ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾﴾ الأعراف: ٨-٩. واتە : ( لە ڕۆژی قیامەتدا بە تەرازووی ڕاست و دروست کردار و گوفتارتان دەکێشرێت ، ئەوانەی لە تەرازوودا چاکە و خێریان سووك بوو ئەوانە زەرەرمەندی هەردوو دنیان و ئەوانە ستەمکار بوون بە بەڵگەکانی ئێمە ) .

**پ١٢٢: ئایا بەڵگەی تەرازوو کێشان چی یە لە سوننەتدا ؟**

و: پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت ( عبدالله کوڕی مەسعود ) فەرمووی : ( اتعجبون من دقة ساقيه و الذي نفسي بيده إنهما في الميزان أثقل من أحد) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( ئایا سەرتان لە لاوازی و باریکی قاچەکانی عبدالله ی کوڕی

مەسعود سووڕ دەمێنێ ، بەو زاتەی گیانی منی بەدەستەوەیە لە تەرازووی قیامەتدا لە کێوی ئوحود قورسترن ) .

( وإنه ليؤتى بالرجل العظيم السمين يوم القيامة لا يزن عندالله جناح بعوضة ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی زۆر قەڵەو دەهێنرێت لای خوا کێشانەی باڵە مێشولەیەکی نی یە ) .

## پ١٢٣: بەڵگەی بوونی پردی سیرات لە قورئاندا چی یە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾﴾ مريم: ٧١-٧٢ .

واتە: (ئێوە ئەی خەڵکینە هەمووتان بەسەر دۆزەخدا تێ دەپەڕن وە ئەم پێشهاتە کارێکی خوایی یە و لەسەر خۆی بڕیاری داوە سەر جێ بەجێ دەکرێت ، پاشان ئەوانەش ڕزگار دەکەین کە خوا ناس بوون و ستەمکارانیش لە دۆزەخدا بە چۆکدا دێنین ) .

## پ١٢٤: بەڵگەی بوونی پردی سیرات لە سوننەتدا چی یە ؟

و: فەرموودەی زۆرن سەبارەت بە پردی سیرات ، لەوانە :-

( يؤتى بالجسر فيجعل بين ظهري جهنم قلنا يا رسول الله وما الجسر ؟ قال : مدحضة مزلة عليه خطاطيف و كلاليب و حسكة مفلطحة لها شوكة عقيفا تكون بنجد يقال لها ، السعدان يمر المؤمن عليها كالبرق و كالريح و كأجاويد الخيل و الركاب . فناج مسلم و ناج مخدوش ومكدوس في نار جهنم حتى يمر آخرهم يسحب سحبا ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( پردی سیرات دەهێنرێت و دەخرێتە سەر دۆزەخ ، وتمان ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پردی سیرات چی یە ؟ فەرمووی : پردێکی

لاواز کەر و زەلیلکەرە لە هەردوو دیوەوە گیرەو قولاپ و دڕکی پێوەیە — پان و بەرینە — دڕکێکی پێچاو پێچی هەیە کە لە ناوچەی نەجد دەڕوێت پێی دەوترێت ( السعدان ) موسڵمان بەسەریدا تێدەپەڕێت بەوێنەی بروسکەو بەوێنەی با و بەوێنەی ڕۆشتنی ئەسپی زۆر چاك وە بەڕۆشتنی ئاسایی ، موسڵمان هەیە ڕزگاری دەبێت وە موسڵمان هەیە بریندار دەبێت وە موسڵمان هەیە تێیدا هەڵدەگۆزرێت لە ئاگری دۆزەخدا تا کۆتا موسڵمان لە دۆزەخدا ڕادەکێشرێت و ڕزگار دەکرێت .

ئەبو سعید دەگێڕێتەوە و دەڵێت : ( پێم گەیشتووە کە پردی دۆزەخ باریکترە لە موو و تیژ ترە لە شمشێر ) .

## پ١٢٥: بەڵگەی تۆڵە سەندنەوەی قیامەت لە قورئاندا چی یە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ النساء: ٤٠ .

واتە : ( بێ گومان خوا بەقەدەر گەردیلەیەك ستەم لە ئادەمیزاد ناکات خۆ ئەگەر چاکەیەك بکرێت چەند بەرانبەری دەکات و لەلایەن خۆیەوە پاداشتی گەورە و بێ سنوور دەبەخشێت ) .

﴿يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ غافر: ٢٩ . واتە : ( بێ گومان خوای گەورە دادوەرە ، لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی دادگای مرۆڤەکان ئەنجام دەدات ).﴿ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴾ غافر: ١٩ واتە : (خوا بە حەق و ڕاستی دادوەری دەکات بەڵام ئەوانەی جگە لە خوا هاواریان لێدەکەن (دەیانپەرستن)ناتوانن بڕیاری هیچ شتێك بدەن بەڕاستی هەر خوا بیسەرو بینایە)

**پ١٢٦ : بەڵگەی تۆڵە سەندنەوەی قیامەت لە سوننەتدا چی یە ؟**

و: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( أول ما يقضى بين الناس في الدماء ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( یەکەم شتێك کە دادگایی لەسەر دەکرێت لە قیامەتدا لە نێوان خەڵکی مەسەلەی خوێنە ).

هەروەها فەرموویەتی : ( يخلص المؤمنون من النار فيجلسون على قنطرة بين الجنة و النار فيقص لبعضهم من بعض مظالم كانت بينهم في الدنيا حتى إذا هذبوا ونقو أذن لهم في دخول الجنة ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( ئیمانداران لە دۆزەخ دەردەهێنرێن و دادەنیشن لە (القنطرة) لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا و پاشان مافەکانیان بۆ وەردەگیرێتەوە هەندێکیان لە هەندێکیان بەهۆی ئەو ستەمانەی کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە لە دونیادا هەتا کە پاك بوونەوەو خاوێن کرانەوە لە تاوان مۆڵەتیان پێ دەدرێت کە بڕۆنە بەهەشتەوە ) .

**پ١٢٧: بەڵگە چی یە لەسەر بوونی حەوزی کەسەر لە قورئاندا ؟**

و : خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ الكوثر: ١ . واتە : (ئێمە حەوزی کەوسەرمان بەخشی بە تۆ و تایبەتمان کردووە بە ئوممەتی محمد )(ﷺ) .

**پ١٢٨: بەڵگەو سیفەتی حەوزی کەوسەر لە سوننەتدا چی یە ؟**

و: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( أنا فرطكم على الحوض ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : (من لە پێش هەمووتانەوە ئەڕۆمە سەر حەوزی کەوسەر ) .

هەروەها دەفەرمویت : ( حوضي مسيرة شهر ماؤه ابيض من اللبن وريحه أطيب من المسك و كيزانه كنجوم السماء من شرب منه فلا يظمأ أبداً ) ئیمام بوخاری وموسلیم ریوایەتیان کردووە . واتە : ( حەوزەکەم بەدرێژایی یەك مانگ ڕێگا ڕۆشتنە ئاوەکەی لە شیر سپی ترەو بۆنەکەی لە میسك خۆشترە و جامی ئاو خواردنەوەکانی لە ژمارەدا وەك ئەستێرەی ئاسمان وایە ، ئەوەی لێی بخواتەوە ئیتر هەرگیز تینوی نابێت ) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت : ( أتيت على نهر حافتاه قباب اللؤلؤ المجوف فقلت ما هذا يا جبريل قال هذا الكوثر ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( هاتمە سەر ڕووبارێك لێوارەکانی بریتی بوو لە گومەز کە بە مرواری ناو بۆش دروست کرابوو وتم بە جوبرئیل ئەمە چییە فەرمووی ئەمە حەوزی کەوسەرە ) .

## پ١٢٩: بەلگەی بوونی بەهەشت و دۆزەخ لە قورئان و سوننەتدا چی یە ؟

و: خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمویت : ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ۝٢٤ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ البقرة: ٢٤-٢٥ . واتە : (لەو ئاگرە بترسن کە سوتەمەنی یەکەی مرۆڤ و بەردە و ئامادە کراوە بۆ کافر و بێ بڕوایان وە مژدە بدە بەوانەی موسڵمانن و کاری چاك دەکەن کە باخچەیان بۆ ئامادە کراوە و بە ژێریدا ڕووبار تێ دەپەڕێت ) .

پێغەمبەر (ﷺ) لە دوعاکانی لە شەو نوێژدا دەیفەرموو : ( ولك الحمد أنت الحق ووعدك الحق و لقاؤك حق ، والجنة حق والنار حق و الموت حق والنبيون حق و محمد (ﷺ) حق والساعة حق ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( سوپاس بۆ تۆ تۆ ئەی خوایە تۆ ڕاستی و پەیمانەکەت ڕاستە ، چاو پێکەوتنت ڕاستە ، و گوفتارت ڕاستە و بەهەشت ڕاستە و هەیە ، دۆزەخ ڕاستە و هەیە و پێغەمبەران ڕاستن و نێراون و محمد ڕاستە نێرراوی تۆیە و قیامەت ڕاستە دێتەدی ).

## پ۱۳۰: واتای بڕواهێنان بە بەهەشت و دۆزەخ چی یە ؟

**و:** واتای بڕواهێنانێکی یەقینی و دڵنیابونە بەبونیان و ئێستا هەردوکیان دروست کراون لەلایەن پەروەردگارەوە و بەهەشت و دۆزەخیش دەمێننەوە بە بڕیاری خوای گەورە لە ناو ناچن و مانەوەشیان ئەو خۆشی و سزایەش دەگرێتەوە کە لە هەردوکیاندا دیاری کراوە .

## پ۱۳۱: بەڵگەی ئەوە چی یە کە ئێستا بەهەشت و دۆزەخ هەیە ؟

**و:** خوای گەورە ئاگاداری بەندەکانی خۆی کردووە ، وەك لە قورئاندا باسی ئامادەکردنی بەهەشت بۆ ئیمانداران دەکات ﴿ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ ﴾ آل عمران: ۱۳ ، واتە : ( پیێ!شبرکیێ! بکەن بۆ لێبوردنێکی گەورە لەلایەن پەرودردگارتانەوە وە بۆ بەهەسشتێك کە پانیەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەویە کە ئامادەکراوە بۆ لەخواترسان) و باسی دۆزەخیش دەکات بۆ کافران ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ آل عمران: ۱۳۰ ، واتە: ( خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە ئامالدەکراوە بۆ بۆ بێ باوەڕان ) وە خوای گەورە

هەواڵی ئادەم و حەوای دایك و باوکمانی پێ داوین کە پێش ئەوەی لە درەختەکە بخۆن خوا لەبەهەشتدا نیشتەجێ ی کردوون ، بەهەمان شێوە فەرمووده هەیە لەسەر ئەوەی کافران لە قەبرەکانیاندا ئێوارەو بەیانیان شوێنەکانی خۆیان لە دۆزەخدا نیشانیان دەدرێت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( أبردوا باصلاة فإن شدة الحرمن فيح جهنم ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( نوێژی نیوەڕۆ کەمێك درەنگ بخەن تاکو تینی گەرماییەکەی نیوەڕۆ دەڕوات لە کاتی زۆر گەرمدا — چونکە توندی گەرما لە تەوژم و وورژاندنی دۆزەخەوەیە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ( لما خلق الله الجنة والنار أرسل جبريل الى الجنة فقال : إذهب فأنظر اليها ) ئیمام تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : (کاتێك خوا بەهەشت و دۆزەخی دروست کرد جوبرەئیلی نارد بۆ بەهەشت و فەرمووی بڕۆ سەیری بەهەشت بکە ) .

## پ١٣٢: بەڵگەی مانەوەی بەهەشت و دۆزەخ چی یە بە بەردەوامی ؟

**و:** خوای گەورە ئاگاداری کردووین کە بەهەشت و ئەوانەی تێیدایەتی بەردەوام دەمێننەوە و مردن و لە ناوچوون نابینن ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ التوبة: ١٠٠ . واتە : ( تێیدا بەهەتا هەتایی دەمێننەوە و نامرن تێیدا و ئەوەش سەرکەوتنێکی گەورەیە ) . هەروەها باسی دۆزەخ و دۆزەخیی یەکان دەکات کە هەرگیز نامرن و لە ناوچوون بەسەریاندا نایەت : ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾﴾ الأحزاب: ٦٤-٦٥ . واتە : ( خوا نەفرینی کردووە لە کافران و بە دووری گرتوون لە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی و دۆزەخی بۆ ئامادە کردوون بەنەمری تێیدا دەمێننەوە بەهەتا هەتایی و هیچ دۆست و پشتگیریان نی یە ) .

﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾ طه: ٧٤ .

واتە : ( بێ گومان ئەوەی بەگوناهی گەورە و شیرکەوە بمرێت ئەوە دۆزەخ جێگایەتی نەدەمرێ و نەدەژی( بە ژیانێکی بەختەوەری )) .

لەم ئایەتانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کافران لە دۆزەخ نایەن دەرەوە و وازیان لێ ناهێنرێت و بەنەمری تێیدا دەمێننەوە بە هەمان شێوەش بەهەشتیەکان .

﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾

الدخان:٥٦ . واتە : ( ئازاری مردن ناچێژن لە بەهەشتدا و تێیدا نامرن تەنها یەك جار نەبێت کە مردوون لە ژیاندا و خوای گەورە لە سزای دۆزەخ پاراستونی) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( إذا صار أهل الجنة الى الجنة وأهل النار الى النار جيء بالموت حتى يجعل بين الجنة والنار ثم يذبح ثم ينادي مناديا اهل الجنة لا موت يا اهل النار لاموت فيزداد اهل الجنة فراحا الى فرحهم ويزداد أهل النار حزنا الى حزنهم) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( کاتێك بەهەشتیەکان چوونە بەهەشتەوەو دۆزەخیەکان چوونە دۆزەخەوە مردن لە دیمەنی مەڕێك دەهێنرێتە نێوان بەهشت و دۆزەخەوە پاشان سەردەبڕێت ،جارچیەك بانگ دەکات ئەی ئەهلی بەهەشتی جێگای هەمیشەیی مانەوە و بێکۆتایی وە ئەی ئەهلی دۆزەخ جێگەی مانەوە و هەتا هەتاییتانە لەمەودوا مردن نەما ، بەهەشتیەکان کەیف و خۆشیان زیاد دەکات و دۆزەخیەکان پەژارەیان زیاتر دەبێت ) .

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ مريم: ٣٩ . واتە : ( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ستەمکاران ئاگاداربکە لە ڕۆژی خەفەت و پەشیمانی کاتێك کار لە کار ترازاوە لە کاتێکدا ئەوانە لە غەفڵەت دا بوون و باوەڕ ناهێنن ) .

**پ١٣٣: بەلگە چی یە لەسەر ئەوەی کە خوا لە رۆژی دوایی دەبینرێت لەلایەن ئیماندارانەوە ؟**

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ یونس: ٢٦ .

واتە : ( بۆ ئەوانەی چاکە خواز بوون ، لە قیامەتدا بەهەشتیان هەیە و زیاتریش لەوە( کە بینینی خوایە بە چاوی سەر) ) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( إنكم سترون ربكم عينا كما ترون هذا لا تضامؤون في رؤيته ، فان استطعتم ان لا تغلبوا على صلاة قبل طلوع الشمس و صلاة قبل غروبها فافعلوا )) ئیمام بوخاری وموسلیم ریوایەتیان کردووە .

واتە : ( ئیوە خوای خۆتان بە چاوی سەرتان دەبینن هەر چۆن مانگی چواردە دەبینن و بێزار نابن لەبینینی ئەگەر توانیتان با لەکیستان نەچێت نوێژێك پێش هەلهاتنی خۆر و نوێژێك پێش ئاوا بوونی ئەگەر بۆتان لوا جێبەجێ ی بکەن ) .

هەروەها دەفەرموێت : ( فيكشف الحجاب فما أعطوا شيئا أحب اليهم من النظر الى ربهم عز وجل ) ئیمامی موسلیم و ترمیزی ریوایەتیان کردووە .

واتە : ( خوای گەورە پەردە لە رووی خۆی لادەدات و ئیمانداران دەیبینن بە چاوی سەریان هیچ شتێك بەلایانەوە لە سەیرکردنی خوای گەورە خۆشتر نی یە ) .

لەم بارەیەوە (٤٥) فەرموودەی صەحیح هەیە کە لە (٣٠) صەحابەوە زیاتر ریوایەت کراوە کە ئیمانداران خوای خۆیان لەبەهەشتدا دەبینن وە ئەوەی بڕوای بەمە نەبێت ئەوە قورئان بەدرۆ دەخاتەوەو پێغەمبەریانیش بە درۆ دەخاتەوە سەبارەت بەوەی کە گەیاندوویانە .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾ القيامة: ٢٢-٢٣ . واتە : ( لەو ڕۆژەدا ڕووی ئیمانداران گەشاوەو ئاسودەن چونکە هەریەك بۆخۆی بە چاوی سەر تەماشای پەروەردگاری دەكات ) .

## پ١٣٤: بەڵگە چی یە لەسەر باوەڕهێنان بە شەفاعەتو کێ شەفاعەت دەكات و بۆ کێ یە و کەی دەبێت ؟

و: خوای گەورە لە قورئاندا لە چەندین شوێندا بابەتی شەفاعەتی ڕوون کردۆتەوەو سنوور و مەرجی قورسی بۆ داناوە ، وە ئاگاداری کردووینەتەوە کەتەنها خۆی خاوەنی ئەو بڕیارەیە و کەسی تر هیچی بەدەست نی یە وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا﴾ الزمر: ٤٤ .

واتە : ( تکا کارو شەفاعەت وەرگرتن هەر هەمووی لەدەست خوادایە) .

وە دەربارەی ئەوەی کە شەفاعەت کەی دەکرێت خوای گەورە ئاگاداری کردووین کە شەفاعەت بە بێ مۆڵەتی خۆی نابێت هەر کات مۆڵەتی دا لە قیامەتدا ئەو کاتە شەفاعەت دەکرێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ البقرة: ٢٥٥ . واتە : ( کێ هەیە تکا کار بێت لەلای ئەو مەگەر خۆی مۆڵەتی دابێت ) ، ﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِن بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ یونس: ٣ . واتە : ( هیچ کەس نی یە شەفاعەت خوازو تکا کار بێت مەگەر دوای مۆڵەتدانی خوای پەروەردگار بێت ) .

وە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لَّا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾ مريم: ٨٧ ، واتە : ( بێباوەڕان کەس تکا کاریان نی یە و تکاکردن بەدەست ئەوان نی یە بەڵکو بۆ ئەو کەسەیە کە لە کاتی خۆیدا خوای میهرەبان

بەڵێنی داوەتێ لە پێغەمبەران و شەهیدان ) . هەروەها تکاو شەفاعەت بۆ کەسێك دەکرێت کە خوای لێ ڕازی بێت و لە دونیادا یەکتا پەرست و دڵسۆز بووبن بە دینی خوا وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ﴾ الأنبياء: ٢٨ ، واتە : ( فریشتەکانیش شەفاعەت کار نابن بۆ ئەوانە نەبێت کە خوا لێ یان ڕازی یە ) ، ﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾﴾ غافر: ١٨ ، واتە : ( ستەمکاران هیچ دڵسۆز و پشتیوانێکیان نی یە ، کەس تکا کار و غەم خۆریان نابێت کە قسەی ڕەواجی هەبێت و تکای لێ وەربگیرێت ) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری کردووین کە شەفاعەت کردنی پێ بەخشراوە ، هەروەها فەرموویەتی لە قیامەتدا پێغەمبەر (ﷺ) دەڕوات لە ژێر عەرشدا سوپاس و ستایشی پەروەردگار دەکات بە شێوازێك کە فێری دەکات لەو کاتەدا کەس شەفاعەت ناکات تا خوای گەورە مۆڵەتی نەدات وەك لە فەرموودەیەکی صەحیحدا هاتووە ( ارفع رأسك وقل يسمع وسل تعط وأشفع تشفع ) ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( سەرت بڵند بکەو بڵێ و قسە بیستراوی ، داوا بکەو پێت دەبەخشرێت ، تکا بکەو لێت وەردەگرێت ) .

هەروەها لەفەرموودەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە کە یەك جار شەفاعەت ناکات بۆ هەموو گوناهباران و تاوانکاران بەڵکو ڕێژەیەکی بۆ دادەنێن و دەچنە بەهەشتەوە ، جارێکی تر کوڕنوش دەبات بۆ پەروەردگار و شەفاعەت بۆ ڕێژەیەکی تر دەکات ، ئەبو هورەیرە بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) ووت ( من أسعد الناس بشفاعتك ؟ قال : من قال لا اله الا الله خالصا من قلبه )

واتە : ( کێ بەختەوەرترین کەسە بە شەفاعەتت لە قیامەتدا ؟ فەرمووی : هەر کەس بەنیەت پاکی و دڵسۆزی یەوە لە دڵەوە بڵێ ( لا اله الا الله ) ) .

**پ١٣٥: چەند جۆر شەفاعەت هەیەو کامیان گەورە ترە ؟**

**و: یەکەم :** گەورەترین شەفاعەت کەدەکرێت لە ڕۆژی وەستاندنی ڕۆژی قیامەتدا یە کاتێك خوای گەورە دێت بۆ جیا کردنەوە و دادگایی بەندەکانی ، ئەو شەفاعەتەش تایبەت بە ( محمد ) پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەویش ئەو پێگا و مەنزڵە سوپاس گوزاریە یە ( المقام المحمود ) ، کە خوا پێی دەبەخشێت ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾ الأسراء: ٧٩ . واتە : ( بەڵکو خوای گەورە بتخاتە شوێن و مەنزڵێکی بەرێز کە لەو شوێنەدا سوپاس کراوبیت ) .

ئەویش لە کاتێکدا کە خەڵکی زۆر بێزار و بێ تاقەت دەبن لە زۆری چاوەڕێ کردن لە قیامەت دا و دڵە ڕاوکێ و ناڕەحەتی هەڵوێستەکە و زۆر عەرەق ڕشتن وایان لێ دەکات کە داوا بکەن شەفاعەتیان بۆ بکرێت و خوای گەورە بێت و حوکمی دادی خۆی ڕابگەیەنێت و بەهەشتی و دۆزەخیەکان جیابکاتەوە ، لەبەر ئەوە دەڕۆن بۆ لای ئادەم و پاشان نوح و پاشان ابراهیم و پاشان موسی و عیسا بەڵام هەموویان دەستە بە دەستە ڕەوانەیان دەکەن و خەمی نەفسی خۆیانە ، پاش ئەوان دەڕۆن بۆ لای محمد پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش دڵیان خۆش دەکات و دەڕوات بۆ لای پەروەردگاری و شەفاعەتیان بۆ دەکات هەروەك لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە.

**دووەم :** شەفاعەت بۆ کردنەوەی دەرگای بەهەشتە و یەکەم کەسێك دەرگای بۆ دەکرێتەوە محمد پێغەمبەر (ﷺ) و یەکەم نەتەوەیەك بڕواتە بەهەشەوە نەتەوەی پێغەمبەرمان (ﷺ) .

**سێ یەم :** شەفاعەت بۆ کەسانێکن کە خوا فەرمانی داوە ببرێنە دۆزەخەوە بەڵام دەگەڕێنرێنەوە و ناچنە دۆزەخەوە .

**چوارەم :** شەفاعەت بۆ ئەوانەیە لە دۆزەخدان و تاوانبار و گوناهبار بوون بەلام یەکتا پەرست بوون و ئیمانیان هەبووە ، ئەوانە دەردەهێنرێنەوە پاش ئەوەی وەك خەلوزیان لێ هاتووە و دەخرێنە ڕووباری ( ژیان )ەوە و ئەبوژێنەوە و چاك دەبنەوە هەروەك سەوز بوونی تۆو لە زەوی یەکی بەپیت و ئاوداردا .

**پێنجەم :** شەفاعەت بۆ بەرز کردنەوەی پلەکانی ئەهلی بەهەشتە .

شەفاعەتی سێ هەم و چوارەم و پێنجەم تایبەت نی یە بە محمد (ﷺ) بەلام ئەو پێشەنگە و لە پێش هەموانەوە شەفاعەت دەکات و پاش ئەویش پێغەمبەرانی ترو پاش ئەوانیش فریشتەکانی خوا و پیاو چاکان و خۆشەویستەکانی خوا شەفاعەت دەکەن ، پاشان خوای گەورە بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی چەندین نەتەوە و چین لە دۆزەخ دەهێنێتە دەرەوە و دەیان خاتە بەهەشتەوە بەبێ شەفاعەت .

**شەشەم :** شەفاعەت بۆ کەمکردنەوەی سزای هەندێك لە دۆزەخیەکان ئەمەش تایبەت بە پێغەمبەرمان (ﷺ) شەفاعەت دەکات بۆ مامی ( أبو طالب ) کە سزای دۆزەخی لەسەر کەم بکرێتەوە . وەك لە صەحیحی ئیمامی بوخاری و موسلیمدا هاتووە .

دۆزەخ بەبەردەوام خەلکی تێ دەخرێت و خەلکی بۆ دەهێنرێت ئەویش هەر دەلێت ئەگەر زیاد هەیە بۆم زیاد بکەن ( هل من مزید ) بەلام خوای گەورە پێی تێ دەخات و هەندێکی دەچێت بەناو هەندێکی تردا و دۆزەخ دەلێت بەسە بەسە ئیتر دۆزەخ داوا ناکات خەلکی بۆ بهێنرێت . بەهەشتیش پاش ئەوەی هەموو ئەوانەی شیاون دەڕۆنە ناوی شوێنی زیادی تێدا دەمێنێتەوە و خوای گەورە هەندێك نەتەوەی تازە دروست دەکات و دەیان خاتە بەهەشتەوە و تێیدا دەژین .

**پ١٣٦: ئایا کەس دەچێتە بەهەشت یان ڕزگاری دەبێت لە دۆزەخ بە کردەوەی خۆی ؟**

**و:** نەخێر – چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( سددوا ، قاربوا ، ابشروا فانه لن یدخل الجنة احدا عمله – قالوا : ولا انت یا رسول الله ؟ قال ولا أنا الا ان یتغمدني الله منه برحمته و اعلموا ان احب العمل الی الله ادومه وان قل ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( کەلێنەکان پڕبکەنەوە و لێك نزیك بن و مژدە دەربڕن ، کەس ناچێتە بەهەشتەوە بەکردەوەی خۆی ، ووتیان : تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی : بەڵێ منیش مەگەر خوا خۆی ڕەحمەت بارانم بکات ، بزانن کە خۆشەویسترین کارێك لای خوا ئەوەیە کە بەردەوامی تێدا بێت گەر کەمیش بێت ) .

**پ١٣٧: چۆن ئەم فەرموودەیە یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێت :** ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ الأعراف : ٤٣ .

واتە : ( بانگ ئەکرێن و پێتان ڕادەگەیەنرێت کە ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە بەدەستان هێناوە لە ئەنجامی ئەو کارو کردەوەیەی کردووتانە لە دونیادا ) .

**و:** فەرموودەکە و ئایەتەکە دژ بەیەك نین و تەواوکەری یەکترن چونکە پیتی ( ب ) لە ئایەتەکەدا ( باء السببية ) یە واتە بەڵێ بەهۆی کردەوەی چاك دەڕۆنە بەهەشت بەڵام ئەگەر ڕەحمەت و بەزەیی خوا نەبێت بەندەکانی خوا شەو بەردەوام شەو نوێژ بکەن و ڕۆژیش بەڕۆژوو بن و هەمیشە لەکاری خێرو چاکەدا بن و دووربن لە تاوان هێشتا ناگاتە پاداشتی بچوکترین نیعمەت لەو بەهرە و نیعمەتانەی خوا بەخشیوویەتی بەبەندەکانی لە دونیادا چ جای پاداشتی بەهەشتی لەسەر وەربگرن .

## پ١٢٨: بەلگە چی یە لەسەر بڕوا هێنان بەقەدەر[١٢] ؟

و: بەلگەمان قورئان و فەرموودەیە ، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت : ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ الأحزاب: ٣٨ . واتە : ( بەردەوام کاروباری خوا بەڕێژەی دیاری کراو و نەخشە بۆ کێشراو جێ بەجێ دەکرێت ) .

﴿لِّيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ الأنفال: ٤٢ .

واتە : ( خوا دەیەوێت کارێك بێنێتە پێشەوە کە بڕیاری لەسەر داوە و بەویست و دەسەلاتی ئەو بەئەنجام گەشتووە ) .

﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ التغابن: ١١ .

واتە : ( هیچ ڕووداو کارەساتێك نایەتە بوون بە فەرمانی خوا نەبێت ) .

پێغەمبەریشمان (ﷺ) لە کاتێکدا جوبرائیل سەبارەت بە پایەکانی ئیمان لێی پرسی فەرمووی : ( وتؤمن بالقدر خیره وشره ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە. واتە : ( بڕواهێنان بەقەدەر بەخێر و شەڕیەوە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ( و ان اصابك شيء فلا تقل لو انی فعلت لكان كذا و كذا ولكن قل قدر الله وماشاء فعل ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( ئەگەر تووشی

---

[١٢] قەدەر : ڕوون کردنەوەی ئەندازەی شتەکان لە بووندا—ئەندازە گیرو نەخشە کێشان و بەرنامە دانانی خودا بۆ هەرچی بووە و دەبێت .

قضاء : واتە حوکم کردنی خوا بەجێ بەجێ کردنی ئەو شتانەی کە خوا لە ئەزەلەوە بە زانیاری بێسنووری ئاگادار بووە کە چۆن دەبێت و لەسەر ویستی خۆی لە کات و شوێنی تایبەتی دا و بەو شێوە و چۆنەتییەی بۆی دیاری کراوە جێ بەجێ دەکرێت .

شتێك بوویت مەڵێ ئەگەر وابم کردایە ئاوا دەبوو ، بەڵکو بڵێ قەدەری خوایە و چی بووێت دەیکات ) .

( كل شيء بقدر حتى العجز والكيس ) ئیمام موسلیم ریوایەتی کردووە . واتە : (هەموو شتێك بەرێژیەکی دیاری کراوە تەنانەت نەتوانایی و ژیریش ) .

## پ١٣٩: پلەکانی بڕواهێنان بە قەدەر چەندن ؟

- بڕواهێنان بەقەدەر لە چوار پلە پێك دێت :

**یەکەم :** بڕواهێنان بە زانستی خوا . بەرەی هەموو شتێك لە بونەوەردا ئەگەر ناوکە ئەتۆمۆکیش بێت لێی ون نابێت لە ئاسمانەکان و زەویدا ، خوای گەورە زانستی هەبووە بەسەر دروست کراوەکانیدا پێش ئەوەی دروستیان بکات و ئاگادار بووە لەسەر رزق و ڕۆزیان و کاتی نەمانیان و مردنیان ، و زانستی هەبووە لەسەر کار و کردار و گوفتار و جموجوڵیان و هەڵس و کەوت و پەنهانی و ئاشکرایان ، و زانستی هەبووە کە کێ لە دروستکراوەکانی دەچێتە بەهەشت و کامیان دەچێتە دۆزەخەوە .

**دووەم :** بڕواهێنان بەوەی کە خوای گەورە هەرچی زانیوە و ڕوودەدات نوسیویەتی وە بڕواهێنان بە بوونی لەوح و قەڵەم .

**سێیەم :** بڕواهێنان بە ویستی خوایی جێ بە جێ کراو ، وە بڕواهێنان بەوەی دەستەڵاتی خوایی تاك و تەنها هەمە لایەنەیە و هەردوکیشیان پێکەوە گرێ دراون لەوەی کەچی بووە لەوەو پێش و چی ڕوودەدات لە داهاتوودا ، پەیوەندیان بەیەکەوە نی یە لە ڕووی ئەوەی کە نەبووە و ئەوەی کەهەیە ، ئەوەی خوا بیەوێت دێتە دی بەدەستەڵاتی خۆی ، ئەوەی کە ویستی لەسەر نەبێت نایەتە دی ، لەبەر ئەوەی کەویستی لەسەرنی یە نەك لەبەر ئەوەی توانای نی یە ، چونکە خوای تاك و

تەنها دەستەڵاتی هەیە بۆ هەموو شتێك ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾ فاطر: ٤٤ . واتە : ( خوای تاك و تەنها هیچ شتێکی لەدەست دەرناچێت نەلە ئاسمانەکان و نەلە زەویدا هەرچی بیەوێت دەیکات و خوا زانا و بەدەستەڵاتە ) .

**چوارەم** : بڕوامێنان بەوەی کە خوا خولقێنەر و بەدیهێنەری هەموو شتێکە ، لە ناوکە ئەتۆمەکەوە و لە بچوکتریان گەورەتر لە ئاسمانەکان و زەویدا خوا خولقاندوویەتی و هێناویەتە بوون و دروست کەری هەموو جموجوڵەکان و هەڵسوکەوتە کانیشیەتی ، پاك و بێ گەردی بۆ پەروەردگار هیچ دروستکەرێکی تر نیەیە جگە لە خۆی و هیچ پەروەردگارێك نی یە جگە لەخۆی .

**پ١٤٠: بەڵگە چی یە لەسەر باوەڕهێنان بە پلەی یەکەمی قەدەر کە ئەویش زانستە؟**

**و:** بەڵگەمان قورئان و سوننەتە ، خوای گەورە لە قورئان دا دەفەرموێت ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ الحشر: ٢٢ . واتە : ( جگە لە الله هیچ پەروەردگارێك نی یە تەنها خۆی نەبێت و زانایە بە جیهانی دیار و نادیار ) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا﴾ الطلاق: ١٢ . واتە : ( خوای گەورە زانستی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ) ، یاخود ﴿عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ﴾ سبأ: ٣ ، واتە : ( زانایە بە دنیای نادیار و لێی ون نابێت ناوکە خەرتەلەیەك لە ئاسمانەکان و زەوی دا ئەگەر لەوەش بچوکتر بێت یان گەورە تر ) یان دەفەرموێت : ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾

البقرة: ٢١٦ . واته : ( خوا ئەزانێت و ئێوە نازانن ) وە پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت : ( قال رجل یا رسول الله ایعرف اهل الجنة من أهل النار، قال نعم ، قال فلم یعمل العاملون ؟ قال : : کل یعمل لما خلق له أو لما یسر له ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واته : ( پیاوێك ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا خەڵکی بەهەشت و خەڵکی دۆزەخ دیاری یە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، ووتی : ئەی ئەبەرچی کاربکەین ؟ فەرمووی کاربکەن چونکە هەموو کەسێك دروست کراوە بۆ ئەو ئیشەی بۆی ئاسان کراوە ) .

لەفەرموودەیەکی دیکەشدا هاتووە : ( مامنکم من نفس ألا وقد علم الله منزلها من الجنة والنار ، قالوا یا رسول الله فلم نعمل أفلا نتکل ؟ قال ( لا اعملوا فکل میسر لما خلق له ) ثم قرأ : ( فاما من اعطی واتقی و صدق بالحسنی فنیسره للیسری ، و اما من بخل و استغنی و کذب بالحسنی مسنیسره للعسری ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واته : ( هەموو کەسێك خوا جێگەی لە بەهەشتدا یان لە دۆزەخدا دەزانێت . ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا بۆ کاربکەین و بۆ پاڵ نەدەینەوە؟ فەرمووی : نەخێر بەردەوام بن لەکار کردن هەموو کەسێك دروستکراوە بۆ ئەو کارەی بۆی ئاسانکراوە وە دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە بەلام ئەوەی ببەخشێ و لەخوا بترسێ وە بڕوای ببێ بەوەی زۆر چاکە ئەوە بێگومان یارمەتی دەدەین بۆ ڕێی ئاسان وە ئەو کەسەی ڕژدی بکات و خۆی بێنیاز بزانێ وە بڕوای نەبێ بە چاکە ئەوە بێگومان ڕێی سەختی بۆ ئاسان دەکەین ) .

**پ١٤١: بەڵگە چی یە لەسەر بڕواهێنان بە پلەی دووهەمی قەدەر کە ئەویش نووسینی ئەو شتانەیە کە ڕوودەدات ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ یس: ١٢ . واتە: ( هەموو شتێکمان لە (لوح المحفوظ) دا بە ئاشکرایی و ڕوونی تۆمار کردووە ) ، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ﴾ الحج: ٧٠ . واتە : ( هەموو ئەو زانیاریانە لە کتێبێکدا کە (لوح المحفوظ) تۆمار کراوە ) ، ﴿وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ الفاطر: ١١ ، واتە : ( هەر مێینەیەك ئاوس دەبێت و بەچکە دادەنێت یان هەر دروست کراوێك کە تەمەنی بۆ نوسرابێت ژیان دەباتە سەر تا ئەو ڕێژەیە تەواو دەکات و لێ ی زیاد ناکات و لە کاتی خۆیدا دەمرێت و هەر دروست کراوێکیش تەمەن کورتی بۆ نوسرابێت ژیان دەباتە سەر کە بۆی دیاری کراوە و ئەوەش بۆ خوا ئاسانە و زانایە بەهەموو شتێك ) ، و پێغەمبەریش (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت : (ما من نفس منفوسة إلا وقد كتب الله مكانها من الجنة و النار و الا وقد كتبت شقيه او سعيدة ) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( هەرکەسێك گیانی کرابێت بەبەردا خودا جێگەی بۆ نوسیوە لە بەهەشت و دۆزەخدا ئەگەر جێگایشی بۆ دیاری نەکردبێت نوسیویەتی بەدبەخت دەبێت یان بەختەوەر ) .

یان دەفەرمووێ : ( رفعت الأقلام و جفت الصحف ) واتە : ( قەڵەمەکان بەرز کراونەتەوە و مرەکەبی سەرنامەکانیش وشك بونەتەوە ) .

**پ١٤٢: پلەكانی زانستی خوا چی دەگرێتەوە لەودی كە نوسراوە ؟**

**و:** پلەكانی زانستی خوا لەوەی كە نوسراوە دەكرێت بە پێنج بەشەوە :

**یەكەم :** نوسینی ئەوەی كە دەبێت پێش دروست كردنی ئاسمانەكان و زەوی بە ( ٥٠ ) هەزار ساڵ لەكاتێك دا كە خوا قەڵەمی دروست كردووە ئەو نوسراوەش بریتی یە لەوەی كە ڕوودەدەن لە بوون دا.

**دووەم :** نووسینی سنووری تەمەنەكان و كاتی نەمانی دروست كراوەكان لە كاتێك دا خوا پەیمانی لێ وەرگرتن ئەو ڕۆژەی كەفەرمووی ( الست بربكم) ئایا من پەروەردگارتان نیم؟)

**سێ یەم :** نووسینی ڕێژەی تەمەنەكان لە كاتی دروست بوونی تۆو لە ڕەحمی مێینەكاندا .

**چواردم :** نووسینی ئەوەی كە ڕودەدات ساڵانە لەشەوی ( قدر ) دا .

**پێنجەم :** نووسینی ئەوەی ڕوودەدات ڕۆژانە ئەویش جێ بەجێ كردنی ئەوانەی سەرەوە هەمووی هەریەكە و بۆ شوێنی دیاری كراوی خۆی .

**پ١٤٣: بەڵگە چی یە لەسەر تەقدیری ئەزەلی ؟**

**و:** خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ الحدید: ٢٢ ، واتە : ( هیچ بەڵاو ڕووداوێك بۆتان پێش نایەت لەم گەردوونەدا یان لە دەروونی خۆتان دا كە لە (لوح المحفوظ) تۆمار نەكرابێت پێش ئەوەی ڕووداوەكە دروست كراوەكان دروست بكەین ئەوەش بۆ خوا ئاسانە ) پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت : ( كتب الله مقادیر

الخلائق قبل ان يخلق السموات و الأرض بخمسين الف سنة ، قال وعرشه على الماء ) ئیمام موسلیم و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( خودا ئەندازەی ژیانی دروستکراوەکانی نوسیوە پێش دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی بە پەنجا هەزار ساڵ و پێغەمبەریش فەرمووی : عەرشی خوا لەسەر ئاو بووە) .

یان فەرمووی : ( ان اول ما خلق الله القلم فقال له : اكتب . فقال رب و ماذا اكتب ؟ قال : اكتب مقادير كل شيء حتى تقوم الساعة) ئیمام تیرمیزی و ئەبوداود ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( بەڕاستی قەڵەم یەکەم شتێکە خودا دروستی کردووە ( دوای عەرش و ئاو و با ) ە پێی فەرموو بنووسە ، ئەویش ووتی ئەی پەروەردگارم چی بنووسم ؟ فەرمووی بنووسە ئەندازەی ژیانی هەمووشتێك تا هاتنی قیامەت ) .

## پ١٤٤: بەڵگەی ڕێژەی تەمەن چی یە لە ڕۆژی پەیمان وەرگرتن ؟

و: خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ﴾ **الأعراف**: ١٧٢ ، واتە : ( بیریان بێنەوە کاتێك پەروەردگارت لە نەوەی ئادەم کاتێکدا لە پشت باوکیاندا بوون پەیمانی لێ وەرگرتوون هەموو نەتەوەکانی کۆکردەوە لە پشتاو پشتیانەوە لە جیهانی پەنهان و شاراوەدا ، وە کردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوە و فەرمووی ئایا من پەروەردگارتان نیم هەموو ووتیان بەڵێ شایەتین ) ، و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی : ( ان رجلا قال يا رسول الله اتبدأ الأعمال ام قد مضى القضاء ؟ فقال : ان الله تعالى لما اخرج ذرية ادم من ظهره اشهدهم على انفسهم ثم افاض بهم في كفيه فقال هؤلاء للجنة و هؤلاء للنار فاهل الجنة ميسرون لعمل اهل الجنة و اهل النار ميسرون لعمل اهل النار ) ئەلبانی بە صەحیحی داناوە .

واته : ( پیاوێك به پێغەمبەر (ﷺ)ی ووت : ئایا کارەکان ئێستا دەست پێ دەکەن یان پێش وەخت دیاری کراوە ؟ فەرمووی : کاتێك خوا نەوەی ئادەمی له پشتی باوکیاندا دەرهێنا و کردنی به شایەت بەسەر خۆیانەوە پاشان خستنیه هەردوو دەستی و بڵاوی کردنەوە و فەرمووی : ئەمانە بۆ بەهەشت ، ئەمانەش بۆ دۆزەخ ، ئەوانەی بەهەشتین کاری خەڵکی بەهەشت دەکەن و ئەوانەی دۆزەخین کاری خەڵکی دۆزەخ دەکەن ) .

## پ١٤٥: بەڵگە چی یه لەسەر دانان و نوسینی ڕێژەی تەمەن لەگەڵ دروست بوونی تۆو له ڕەحمی دایکدا ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ﴾ النجم: ٣٢ . واته : ( خوای گەورە چاك دەتان ناسێت کاتێك ئێوەی لەزەوی دا بەرپا کردووە پێشتر ئێوە کۆرپەلەی بچوك بوون له سکی دایکتاندا ) ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( ان احدکم ليجمع خلقه في بطن امه اربعين يوما نطفة مثل ذلك ، ثم يكون مضغة مثل ذلك ، ثم يرسل اليه الملك فينفخ فيه الروح ويؤمر باربع كلمات ، بكتب رزقه ، و اجله ، و عمله ، وشقي او سعيد ، فو الذي إله غيره ، إن احدكم ليعمل بعمل أهل الجنة حتى ما يكون بينه و بينهما إلا زراع فيسبعد عليه الكتاب فيعمل بعمل اهل النار فيدخلها و إن احدكم ليعمل بعمل اهل النار حتى ما يكون بينه و بينها إلا زراع فيسبعد عليه الكتاب فيعمل بعمل اهل الجنه فيدخلها) ئیمام بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واته : ( هەریەك له ئێوە دروست بونتان بەم شێوە یه دەبێت که به دڵۆپە ئاوێ چل ڕۆژ له ڕەحمی دایکیدا دەمێنێتەوە ، پاشان دەبێتە سەرە مێکوتەیەك ، پاشان دەبێتە گۆشتە پارەیەك

ئەمەش لەماوەی ( ١٢٠ ) ڕۆژدا پاشان خوا فریشتەیەك دەنێرێت و گیانی بەبەردا دەكات و فەرمانی پێ كراوە چوار ووشە بنوسێت ڕزق و ڕۆزی و مردنی و كردەوەكانی و بەهەشتی یە یان دۆزەخی بەو زاتەی هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لەو هەتانە ئیشی بەهەشتیان دەكات و (بە كافری دەمرێ و دەچێتە دۆزەخەوە هەشە ئیشەكانی لە ئیشی جەهەنەمیانەیە تا لە نێوان ئەو دۆزەخدا باڵێ دەمێنێ لە كتێبەكەیدا بەهەشتی نوسراوە ئەویش ئیشی بەهەشتیان دەكات و دەچێتە بەهەشتەوە) .

## پ١٤٦: بەڵگە چی یە لەسەر ڕێژەی ساڵانە لە شەوی قەدردا ؟

و: بەڵگەمان قورئان وسوننەتە . لە قورئاندا هاتووە : ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾﴾ الدخان: ٤-٥ . واتە : ( لەو شەوە بەفەڕەدا هەموو كارو كردەوەیەك لەیەك جیا دەكرێتەوە ئەمەش فەرمان و بڕیاری لای ئێمە یە ) ، وە ئیبن عباس دەڵێت : ( لە شەوی قەدردا ئەنوسرێت لە ( ام الكتاب ) دا چی ڕووداو هەیە لەماوەی ساڵێكدا لە مردن و ژیان و ڕۆزی و باران تەنانەت ئەوەش كە حەج دەكات دەنوسرێت فلانەكەس حەج دەكات ) بەم شێوەیە چەندین زانای پایە بەرزی سەلەفی صالح هەمان ڕایان هەیە لەوانە ( حسن سعیدی كوڕی جبیر مقاتل و ابە عبدالرحمن سلمی و چەندانی تریش ) .

## پ ١٤٧: بەڵگە دانانی ڕێژەی ڕۆژانە چی یە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ الرحمن: ٢٩ . واتە : ( ڕۆژانە بەندەكان نزاو دوعا دەكەن پەروەردگاریش بە بەزەیی خۆی وەڵامیان دەداتەوە ) .

ئیبن عباس ( ڕەزای خوای لێ بێ ) دەڵێت : ( لەو شتانەی کە خوا خولقاندوویەتی ( لوح المحفوظ )ە کە لە گەوهەرێکی سپی دروست کراوە و لێوارەکانی لە یاقووتی سورن ، پێنوسەکەی لە ڕووناکی یە و نوسینەکەیش لە نورە ، هەموو ڕۆژێك سێ سەد و شەست جار سەیری دەکات لە هەموو سەیر کردنێکدا دروست دەکات و ڕۆزی دەدات و دەژێنێت و دەیمرێنێت و بەرزو بڵند دەکاتەوە و نزم و خامۆش دەکاتەوە و چی بوویت دەیکات ) ئەمەش تەفسیری ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٍ﴾ ، دانانی ئەم هەموو ڕێژەو سنوورانەش بریتی یە لە درێژە پێدان و باسکردنی ئەو قەدەرەی لەوەو پێش خودا دایناوە لە کاتی خۆیدا کاتێك کە خوا فەرمانی کردووە بە قەڵەم کە بنوسێت لە ( لوح المحفوظ ) دا ، هەر بەم شێوەیەش ئیبن عومەر و ئیبن عباس تەفسیری ئەم ئایەتەیان کردووە ﴿إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ الجاثية: ٢٩ . واتە : ( ئێمە فەرمانمان کردووە بە فریشتەکان کە کردەوەکانتان تۆمار بکەن ) ئەمەش هەمووی لە زانستی خوا دەر دەچێت کە یەکێکە لە سیفەتە خۆییەکانی پەروەردگار .

### پ١٤٨: دانانی ڕێژەو کارەکان لەوەو پێش چ پەیوەندیەکی بەختەوەری و بەد بەختی یەوە هەیە ؟

و: هەموو کتێبە ئاسمانیەکان و ڕێبازی پێغەمبەرەکان کۆن لەسەر ئەوەی کە ئەو قەدەرەی خوا دیاری کردووە لەوەو پێشو پێش هاتنە بوون هیچ کات ڕێگر نی یە لەوەی کە کاربکرێت یان ببێتە هۆی پاڵ دانەوەو بێ خەمی ، بەڵکو خاوەنەکەی توندو تۆڵ دەکات لەسەر کار و خێر و چاکە ، لەبەر ئەوە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەم مەسەلەی باس کرد بۆ هاوەڵەکانی هەندێکیان ووتیان کەواتە با پاڵ بدەینەوە و واز لە کارکردن بهێنین ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ( نەخێر وامەکەن کار بکەن هەر

یەکەتان و خوا کار ئاسانی بۆ دەکات ) . خوای گەورە ڕێژەو قەدەرەکانی دیاری کردووە و هۆکارەکانی بۆ ڕەخساندووە و خواش دانا و زانایە لەدەست نیشان کردنی هۆکارەکانی ژیان و زیندوو بونەوە ، وە خوای گەورە کار ئاسانی کردووە بۆ هەموو دروست کراوەکانی چۆن دەیەوێت بژین لە دونیاو دوا ڕۆژدا ، ئەگەر مرۆڤەکان زانیبیان بەرژەوەندیەکانی ڕۆژی دواییان پەیوەستە بە دنیاوە چاکتر و زۆر تر بایەخی پێ دەدات و هەوڵی لە پێناودات دەدات ، ( هەر لەبەر ئەوەشە ئەگەر هە کەس باسی قەدەری بیستبێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چاکتر و گۆج و گۆڵ تر دەبوو لە کار و کردەوەکانیدا ) .

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی : ( احرص علی ما ینفعك و أستعن بالله و لا تعجز ) ئیمام موسلیم و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( سور بە لەسەر ئەوەی سوود مەندە بۆ خۆت و پشت بە خوا ببەستە و دەستە پاچە مەبە ) ، هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا فەرموویان بە پێغەمبەر (ﷺ) : ( ئێمە ئەگەر داو دەرمان بەکاربهێنین بۆ نەخۆشیەکان و دوعا بکەین ، ئایا هیچ لەقەدەری خوا دەگێڕێتەوە ؟ فەرمووی ( هي من قدر الله ) ، واتە : ( ئەوە خۆی لە قەدەری خوایە ) مەبەست پێ ی ئەوەیە کە خوا چاکە و خراپەی دەست نیشان کردووە و هۆکارەکانیشی دەست نیشان کردووە ) .

## پ١٤٩: بەڵگە چی یە لەسەر پلەی سێیەمی بڕوا بە قەدەر ئەویش بڕواهێنانە بە وویستی خوا ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ الأنسان: ٣٠ . واتە : ( هیچ کام لە ئێوە ناتوانن هیدایەتی خۆتان یان ئیمان بخەنە دڵەکانتانەوە سوود بە

خۆتان بگەیەنن مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت ئەویش بۆ کەسێك کە شایستەی بێت و خوا بۆی ئاسان بکات ) .

﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ الأنعام: ٣٩ . واتە : ( خودا گۆڕانکاری دەکات لە دروست کراوەکانیدا هەر چۆن بیەوێت بە موسڵمان کردن یان بە گومڕا کردن ) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( قلوب العباد بين أصبعين من أصابع الرحمن كقلب و احد يصرفها كيف يشاء ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( دڵی بەندەکان لەنێوان دوو پەنجەن لە پەنجەکانی خوای گەورە وەك یەك دڵ وایە چۆن بیەوێت وای هەڵدەسوڕێنێت ) . هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە ( ان الله تعالى قبض ارواحكم حين يشاء وردها حين شاء ) ئیمام بوخاری و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( خوای گەورە گیانتانی کێشاوە هەر کات ویستی لەسەر بێت و گەڕاندیەوە هەرکات وویستی لەسەر بێت ) .

**پ١٥٠: خوای گەورە موسڵمانی خۆش دەوێت و ڕقی لە ستەم کارانە ، ڕازیە لە ئیمانداران و نا ڕازیە لە بێ باوەڕان وە خراپەی پێ ناخۆشە ، ئەمە چۆن دەگونجێت لەگەڵ ویستی خوادا چونکە هیچ شتێك نابێت و نایەتەدی ئەگەر خوا نەیەوێت و ئایا ڕقی لە شتێکە و حەزی لێ ناکات بەڵام مۆڵەت دەدات ببێت ؟**

و: ئیرادەی خوا لە دەقەکانی قورئان و سونەت بە دوو مانا هاتووە :

**یەکەم** : ئیرادەیەکی گەردوونی ویستراو داڕێژراو : کە ئەویش وویست و ئارەزووی خوایە پەیوەست نی یە بە خۆشەویستی و ڕق لێ بوون یان ئیمان و بێ بڕوایی دەسەڵاتێکە و هەمووی لە ژێر ئەو دەسەڵاتەدا کار دەکات و کەس ناتوانێت بچێتە

دەرەوە و ئەگەر واش نەبێت نرخی ئیمان و بێ بڕوایی دەرناکەوێت کێ بە ئارەزووی خۆی موسڵمان دەبێت و کێش کوفر هەڵدەبژێرێت وەك خوای گەورە دەفەرمووێت :

﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ الأنعام: ١٢٥ . واتە : ( هەر کەس خوا بیەوێت هیدایەتی بدات دڵی دەکاتەوە بۆ وەرگرتنی ئیسلام و هەر کەس بیەوێت ڕێ ی لێ تێك بدات دڵی تەنگ و تەسك دەکاتەوە بەرامبەر بە دین ) .

**دووەم** : ئیرادەیەکی دینی شەرعی : کە ئەویش پەیوەستە بەو کارانەی خوا لێ ی ڕازیە و حەزی لێ دەکات و فەرمانی پێ دەکات ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت :

﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ البقرة: ١٨٥ .

واتە : ( خودا ئاسانی ویستووە بۆ ئێوە نایەوێت گرانی و ناڕەحەتی لە سەرتان دابنێت ) . ئەم ئیرادەیەش پەیوەستە بە ئیرادە گەردوونیەکەوە و لێك جیا ناکرێتەوە ، بەڵام موسڵمان ئەوەی خوا حەزی لێ دەکات جێ بە جێ ی دەکات و ئەوەی بێ بڕوایە ئارەزووی خۆی هەڵدەبژێرێت ، خوا داوای کردووە لە بەندەکانی موسڵمان بن و بانگەشەی ئیسلامەتی کردووە ﴿وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ یونس: ٢٥ . واتە : ( خوای گەورە بانگەواز دەکات بۆ لای بەهەشت و هیدایەتی هەرکەسێك دەدات کە ویستی لەسەربێت بۆ ڕێباوی ڕاستە قینە) . هەروەها دەفەرمووێت : ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾ النجم: ٣٠ .

واتە : ( خوای تۆ دەزانێت کێ لا دەدات لە ڕێبازەکەی و خواش خۆی ئاگادارترە کە کێ هیدایەت وەردەگرێت ) .

**پ١٥١: بەڵگە چی یە لەسەر چوارەم پلەی بڕواهێنان بە قەدەر کە ئەویش پلەی دروست کردنە ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ﴾ الزمر: ٦٢ .

واتە : ( خوای گەورە خولقێنەری هەموو شتێکە و هەر خۆی خاوەن و موڵکداری هەموو شتێکە لەم گەردوونەدا ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ﴾ الصافات: ٩٦ . واتە : ( خوا دروستی کردوون ئەوەش کە دەیکەن ) . هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: ( ان الله یصنع کل صانع و صنعته ) ئیمام بوخاری و بەیهەقی و حاکم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو بەدیهێنەرەکان و دروستکراوەکانیانە ) .

**پ١٥٢: ئەم فەرموودەیە مانای چی یە ( والخیر کله في یدیك و الشر لیس الیك ) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتەوە : لەگەڵ ئەوەشدا کە خوا خولقێنەری هەموو شتێکە ؟**

و: فەرموودەکە واتە : ( ئەی خوایە خێر هەر لەدەستی تۆدایە و خراپە ناگەڕێتەوە بۆ تۆ ) ، مەبەست ئەوەیە کە کارەکانی خوا هەمووی چاکەیە و ئەوەی لەخۆیە دەربچێت و پەیوەندی بێت بەخۆیەوە هیچ کات ئەو کارانە خراپەی تێدانی یە چونکە خوا دانایە و دادگەرە کارەکان لەشوێنی خۆیدا دادەنێت ، خراپەکان پەیوەستن بە مرۆڤەکانەوە و لەوانەوە دەردەچێت و ئەوان بە ئەنجامی دەگەیەنن و خواش پێ ی ناخۆشە وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا

كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾ الشورى: ٣٠ . واته : ( ئەوەی تووشتان دەبێت له ناڕەحەتیەکان بەهۆی کردەوەکانتانەوەیە وە چاوپۆشی له زۆریشی کراوه ) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَـٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ یونس: ٤٤ . واته : ( بەڕاستی خودا هیچ ستەمێك له خەڵکی ناکات بەڵکو مەردوم خۆیان ستەم له خۆیان دەکەن ) .

## پ١٥٣: ئایا بەندەکان ئەو کارانەی که ئەنجامی دەدەن هیچ ویست و دەسەڵاتێکیان تێدا هەیە ؟

و: بەڵێ ، بەندەکان دەسەڵاتیان به سەر کردەوەکانی خۆیاندا هەیە ، وە مرۆڤەکان وویست و ئیرادەی خۆیانیان هەیە ، وە کردەوەکانیان ئاڕاستەی خۆیان دەکرێتەوە چونکە خۆیان به ئەنجامی دەگەیەنن و لەسەر کردەوەکانیان پاداشت و سزا وەردەگرن ، خوا ئەرکی خستوەتە سەر شانیان به پێی توانا و ووزەی خۆیان . ئەمەش له قورئان و سوننەتدا جێگیر بووه ، بەڵام ئەوەیە که هیچ شتێك ناتوانێ مەگەر خوا دەستەڵاتی پێ دابێت و هیچ ناکرێت ئەگەر خوا وویستی لەسەر نەبێت ، بەڵام ئەمە مانای وانی یه که هەر شتێکی خراپ بکەن خوا پێ ی کردوون یان خوا حەزی لێ دەکات ، وویست و دەستەڵاتی خوا مەسەلەیەکە و کردن و هەستان بەکاری بەندەکان مەسەلەیەکی تره ، له ڕووی ئەوەی خوا بەدەستەڵات ترینی دەستەڵات دارەکانە و هیچ شتێك ناکرێت بێ وویستی ئەو وایە ئەمەش بەرزی و توانایی خوا دەسەلمێنێت نەك ئەوەی خوا کارەکان به مرۆڤەکان دەکات ، خوا مرۆڤەکانی دروست کردووه و ڕێگەی ڕاست و ناڕاستی دەست نیشان کردووه بۆیانو ئازادیشی کردوون خوا دروست کەر و هیدایەت دەره ، بەڵام مرۆڤەکان لەو چوار چێوەیەدا ئازادن له هەڵسوکوتدا .

**پ١٥٤: ئایا بۆ خوا هەموو بەندەکانی ناکاتە موسڵمانی گوێ ڕایەڵ لە کاتێکدا دەستەڵاتی بەسەر ئەوەدا هەیە ؟**

و: خوا ئەوە دەتوانێت وەك دەفەرموێت : ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ المائدة: ٤٨ ، واتە : ( ئەگەر خوا وویستی لەسەر بێت دەتان کاتە یەك نەتەوە و لەسەر یەك ڕێباز کۆتان دەکاتەوە ) ، بەلام گەر بەو شێوەیە بێت ئەوا حیکمەتی ئیسلام و بێ بڕوایی مانای نەدەما و پاشان بوونی بەهەشت و دۆزەخ هیچ بەهایەکی نەدەبوو ، لەوەش گرنگتر ئەو کات بایەخی نەبوو کە کێ موسڵمان بێت و خوا پەرستی زۆر بکات.چونکە لە دەستەڵاتی خۆیدا نەبوو هەروەك فریشتەکانی خوا کە بەدەست خۆیان نی یە و وا دروست کراون کە چاکە خواز و خێر خواز و خوا پەرست بن ، هەر لەبەر ئەوەش کە خوا پاداشتی مرۆڤەکان دەداتەوە چونکە بە هەوڵ و تێکۆشان وویستی خۆیان موسڵمان بوون و تێدەکۆشن بۆ ئیسلام .

**پ١٥٥: پلەو پایەی ئیمان بەقەدەر چۆنە لە ئیسلامدا ؟**

و: بڕواهێنان بەقەدەر یاسای یەکتا پەرستی یە ، هەروەك بڕواهێنان بەو هۆکارانەی خاوەنەکەی دەگەیەننە چاکە و ڕێگرتن لە بەردەمیدا بۆ خراپە یاسای شەرع و خواناسی یە ، دینی هیچ کەس ڕاست و دروست نابێت ئەگەر بڕوای بەقەدەر نەبێت و لەسەر یاسای شەرع نەجوڵێتەوە . هەرکەس قەدەر بەدەر بکات لە بوون و بڕوای پێ نەبێت و بزانێت نەگونجاوە لەشەرعدا ، ئەوە خوا بەری دەکات لە دەستەڵات و زانیاری و بە زمانی حاڵ ڕایدەگەیەنێت کە جگە لە خوا خولقێنەر و دەستەڵات داری تر هەیە و هەر کەسەو بۆ خۆی دەبێت لەم بوونەدا، و کەس دەستەڵاتی باڵای نی یە،

بەمەش سیفەتەکانی خوا لە بوون نامێنێت ، وە هەر کەس بڕوا بەقەدەر بکات و بەلام دژایەتی پێ بکات و بەرانبەر کێ ی شەرعی پێ بکات و ئازادی و بڕیار لە دەست بەندەکان ، زەوت بکات ئەوە خوا بەستەمکار لە قەلەم دەدەن وە موسلمانانی ڕاستەقینە بڕوایان بەقەدەر هەیە ، خێر و چاکەکەی و شەڕ و خراپەکەی، وە هەروەها پابەند دەبن بە یاسای شەرعەوە چاکەکانی جێ بەجێ دەکەن و لە قەدەغە کراوەکانی بە دوور دەبن ، ئەگەر چاکەیان کرد دەلێن : ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَـٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾ الأعراف: ٤٣ . واتە : ( سوپاس بۆ ئەو خوایەی هیدایەتی داین بۆ ئیسلام ئەگەر خوا ڕێنمایی نەکردینایە هیدایەتمان وەرنەدەگرت ) ، ئەگەر خراپەیەکیش بکەن دەلێن ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ الأعراف: ٢٣ . واتە : (خوایە ستەممان لە خۆمان کرد و ئەگەر لێمان نە بوریت و بەزەیت پێمان نەیەتەوە ڕەنجەڕۆ و خەسارۆ مەند دەبین ) .

## پ١٥٦: پلەکانی ئیمان چەندن ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ البقرة: ١٧٧ .

واتە : ( چاکە و چاکەکاری و خواناسی بریتی نی یە لە ڕووکردنە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا بەلکو چاکە بریتی یە لە بڕواهێنان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە کتێبە ئاسمانیەکان و بە پێغەمبەران ، و پارە بەخشین لەگەل خۆشەویستی دا بۆی بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و ئەوانەی داوای پارە دەکەن بە ناچاری و بەخشینی پارە بۆ ئازاد کردنی کۆیلە کان و لەهەمان کاتدا نوێژ کردن و زەکات دان و وەفا کردن بە پەیمانەکان و ئارام گرتن لەکاتی نەهامەتی و کێشەو ئازاردا و خۆگرتن لەکاتی غەزا و جەنگ دا ، ئەوانەی ئەم سیفەتانەیان تێدایە ڕاستیان ووتووە و ئەوانە لە خوا ترس و خواناسن ) .

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( الأیمان بضع[١٣] وستون ) وفي روایة ( بضع وسبعون شعبة فأعلاها قول لا إله إلا الله وأدناها إماطة الاذى عن الطريق و الحياء شعبة من الأيمان ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( ئیمان شەست و ئەوەندە یان لە ڕیوایەتێکی تردا ها تووە : حەفتا و ئەوەندە بەشە ، بەرز ترینیان ووشەی (لا إله إلا الله) یە و نزمترینیان لادانی ئازارە لە ڕێگاو باندا و شەرم کردن یەکێکە لە بەشەکانی ئیمان ) .

**پ١٥٧: زانایان چۆن تەفسیری ئەو پلانەیان کردووە ؟**

**و:** کۆمەلێك لەو زانایانەی فەرموودەکان ڕاڤە دەکەن پلەکانیان دەست نیشان کردووە و چەندین پەڕاوو نوسراویان لەسەر نوسیوە ، بەلام زانست بوون بە ژمارەو پلەکانی مەرجی ئیمان نی یە تەنها ئەوەندە پێویستە کە ئێمە بە شێوەیەکی گشتی بڕوامان پێی هەبێت ، چونکە بەو پلانەی کە ئیمان دەگرێتەوە لە قورئان و سوننەت

---

[١٣] لەزمانی عەرەبیدا ( بضع ) ( لە ٣-٩ ) دەگرێتەوە .

دەرناچێت ، و لەسەر بەندەکانی خوا پێویستە ملکەچی فەرمانەکانی بن ، و دوور بکەونەوە لە قەدەغەکراوەکان و بڕوامێنان بەوەی کە باس کراوە لە قورئاندا ، بەوەش پلەکانی ئیمان تەواو دەبێت ، ئەو کەسانەش کە پلەکانیان ژماردووە و دەست نیشانیان کردووە ، ناتوانرێت بە دڵنیایی یەوە ئەوە بووترێت کە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بووە ، ئەو مەسەلەیە پێویستی بەوەستان و بیر کردنەوە هەیە .

**پ١٥٨: بە کورتی ئەوەی زانایان لەسەر پلەکانی ئیمان باسیان کردووە چی یە ؟**

و: ئیبنو حەیبان باسی کردووە کە ئەم پلانەی ئیمان دابەش دەبێت بەسەر کاری دڵ و زوبان و کاری جەستەدا .

١- کاری دڵ وەك عەقیدە و نیەتەکان ، کە ئەویش بیست و چوار (٢٤) بەشە ، ئیمان هێنان بە خوا کە ئەویش بڕوا هێنان بەزات وسیفەتەکان و یەکتا پەرستی خوا دەگرێتەوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ شوری: ١١ . واتە: هیچ شتێك نی یە لە وێنەی زاتی خوا بچێت نەلە زات و نە لە سیفاتیدا ) .

ئیمان هێنان بە فریشتەکان و کتێبە ئاسمانییەکان و پێغەمبەران و قەدەر بە خێر و شەڕیەوە و ئیمان بە ڕۆژی دوایی . کاری دڵیش بەهەمان شێوە پرسیاری ناو قەبر و زیندوو بوونەوە و بڵاو بوونەوە و حساب و تەرازوو پردی سیڕات و بەهەشت و دۆزەخ و خۆشویستنی خوا و ، خۆشویستن و ڕق لێ بوونەوە لەبەر خوا و خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) و گەورە گرتنی کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەگرێتەوە .

هەروەها کاری دڵ جگە لەوانەی سەرەوەش سەڵاوەت دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و شوێن کەوتنی سوننەتەکانی و دڵسۆزی بۆ نواندنی و واز هێنان لە ڕیایی و دووڕووی

و تەوبە کردن و لە خوا ترسان و ئومێد بوون و وەفا و ئارام گرتن و ڕازی بوون بە قەزای خواو پشت بەستن بە خواو بەزەیی و خۆ بە بچوك ڕاگرتن لە کارەکانی دڵە .

جگە لەوەش چەندین کاری تر هەیە بە کاری دڵ دادەنرێت لەوانەش ڕێز گرتنی پیاوە بەتەمەنەکان و بەزەیی هاتنەوە بە منداڵاندا و وازهێنان لە قسەی بێ سوود بەکاری زوبان دادەنرێت .

٣-کاری جەستەش سێ سیفەت دەگرێتە خۆی ، هەندێکی پەیوەستە بە خودی ئەو کەسە کە ئەویش پانزە سیفەت لەخۆ دەگرێت ( خۆ پاك کردنەوە ، نان دان بەخەڵکی ، ڕێز گرتنی میوان ڕۆژوو گرتنی فەرز و سوننەت ، ئیعتیکاف ، گەڕان بەشوێن شەوی قەدردا ، حەج گردن ، عومرە کردن ، تەواف کردن بەدەوری کەعبەدا ، کۆچکردن لە پێناوی دیندا ، کۆچ کردن لە وڵاتی موشریکەکاندا ، کەفارەت دان ، دەفاکردن بە نەزر ) .

هەندێکی تر پەیوەستە بە دەورو بەرەوە کە ئەویش شەش سیفەتە ( خۆ پاك ڕاگرتن بە ژن هێنان ، جێ بەجێ کردنی مافی منداڵ ، چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکدا ، دوور کەوتنەوە لە ئازاردان بە گشتی ، پەروەردەکردنی منداڵان ، سەردانی خزم و کەس و کار ، گوێ ڕایەڵی ئەمیرەکان ، سۆز نواندن لەگەڵ کۆیلەکان ) .

هەندێکی تر هەیە کە پەیوەستە بە کاری گشتی یەوە ئەویش حەڤدە ڕەوشتە ( هەستان بە فەرمانرەوایی بە دادگەری عەرەبیەکەی (القیام با المارە بالعدل)، پەیوەست بوون بە جەماعەتەوە ، چاك سازی لە نێوان خەڵکیدا ، جەنگ کردن لەگەڵ دەرچوان لە کۆمەڵی موسڵمانان ، هاوکاری لەسەر چاکە کردن ، فەرمان دان بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە و جێ بە جێ کردنی سنوورە شەرعی یەکان ، جیهاد کردن ، گەیاندنی ئەمانەت ، بەخشینی پێنج یەکە لە دەستکەوتی جەنگ ، وەفا کردن بە دانەوەی قەرز ، ڕێز گرتن لە دراوسێ و چاك مامەڵە کردن لەگەڵیان ،

پارە کۆکردنەوە لە حەڵاڵ و بەخشینی لە جێ ی خۆیدا ، دوور کوتنەوە لە زیادەڕەوی ، وەڵام دانەوەی سەلام ، دوعا کردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێت ، دوور خستنەوەی زەرەر لە خەڵکی ، واز هێنان لە گاڵتەو گەپ ، لابرنی ئازار لە ڕێگەو بان) . ئەمانە هەمووی شەست و نۆ خاڵ دەگرێتەوە وە دەتوانرێت بکرێت بە حەفتا و حەوت بە جیا کردنەوەی هەندێك لە سیفەتەکان لەیەکتر لەوەی کە باس کراوە و خواش چاکتر دەزانێت .

**پ١٥٩: بەڵگەی چاکە کردن ( الأحسان ) چی یە لە قورئان و سوننەتدا ؟**

و: چاکە کردن بەڵگەی زۆرە لەوانەش خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ البقرة: ١٩٥ .

واتە : ( چاکە بکەن خوای گەورە چاك خوازانی خۆش دەوێت )

هەروەها دەفەرموێت : ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ﴾ یونس: ٢٦ .

واتە : ( ئەوانەی چاکە دەکەن بەهەشتیان بۆ هەیە لەگەڵ بینینی خوادا )

﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ﴾ الرحمن: ٦٠ .

واتە : ( چاکە جگە لە چاکە هیچ پاداشتی تری نی یە )

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( ان الله كتب الأحسان على كل شئ ) ئیمام موسلیم و تیرمزی

زی و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( خوای گەورە بڕیاری چاکەی بۆ هەموو کارێکی چاك نوسیوە ) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( نعما للعبد ان يتوفى يحسن عبادة الله و صحابة سيده نعما له ) ئیمام موسلیم و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( ناز و

نیعمەت بەسەر بەندەیەکەوە ئەوەیە تا بمرێت چاك خوا پەرستی بکات و چاك هاوڕێیەتی گەورەکەی بکات ئەوە ڕێز و بەرزی یە بۆی ) .

**پ١٦٠: چاکە کردن لە خوا پەرستی دا چی یە ؟**

**و:** پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەفسیری چاکەی کردووە لە خوا پەرستیدا لەو فەرموودەیەی کە جوبرائیل پرسیاری لێ کرد : ( فأخبرني عن الأحسان قال : ان تعبد الله كانك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك ) ئیمام موسلیم و بوخاری ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( مەبەست لە چاکە چی یە ؟ فەرمووی : ( چاکە ئەوەیە کە خوا بپەرستی وەك ئەوەی کەیبیبینی ، ئەگەر تۆش ئەو نەبینی ئەو تۆ دەبینێ ) ) .

کەواتە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە چاکە دوو پلە یە :

**یەکەم :** بەرز ترینیان خوا پەرستی کردنە وەك ئەوەی کە خوا بە چاوی سەر ببینی ئەمەش پلەی بینایی یە ، ئەویش ئەوەیە کە بەندە کاربکات بەو شێوەیەی خوا دەبینێ بە چاوی دڵ ، چونکە لە دونیادا وەعدی خوا یە و نابینرێ مەبەستیش لەوە کە دڵ بە ئیمان ئەوندە ڕوناك بێتەوە تا یەقینی بگاتە ئەو ئاستەی کە هەموو مەسەلەیەکی غەیبی بەرجەستە بێت لە لای و ئەوەش پلەی یەکەم و چڵە پۆپەی چاکەیە .

**دووهەم :** پلەی چاودێری مەبەست لەوەش ئەوەیە کەبەندە کار بکات و هەست بکات هەمیشە خوا چاودێری دەکات و ئاگادارە لێی و زۆر نزیکە لێوەی ، ئەگەر هەر کەسێك بەم شێوە کاری کرد ئەوە دڵسۆزی و ئیخلاسی نواندووە بۆ خواو ئەمەش وای لێ دەکات کە جگە لە خوا ڕووناکاتە کەسی تر و لایەکی تر ، ئاستی ئەم دوو پلەیە جیاوازن لە تێڕوانین و بیناییدا .

## پ١٦١: چ شتێك دژی ئیمانە ؟

و: کوفر دژی ئیمانە ، کوفر بنچینەیەو چەند پلەیەکی هەیە ، هەر چۆن ئیمان بنچینەیە و چەند پلەیەکی هەیە ، وەك باسمان کرد بنچینەی ئیمان بریتی یە لە بڕوا بوون و بەڕاست زانین و مل کەچ بوون و گوێ ڕایەڵی ، کوفریش بنچینەکەی بە درۆ خستنەوە و سەرکەشی یە لەگەڵ خۆ بەگەورە زانین و خەراپەکاری بەرامبەر بە خوا – چاکەو چاکە کاری پلەی ئیمانن – زۆر لەکاری چاکە خوازی لە قورئان و فەرموودەدا ناو براون بەئیمان – هەروەها کارە خراپەکانیش لە پلەی کوفرن و لە زۆر شوێنی قورئان و سونەتدان ناو هێنراون بە کوفر هەروەك لە دوایدا باسی دەکەین .

کەواتە کوفر دوو جۆرە :–

**یەکەم** : کوفرێك کە خاوەنەکەی لە دین دەردەکات بەیەکجاری ، ئەویش کوفری بڕواداریيە ، کە پێچەوانەی قسەو کرداری دڵ بێت یان یەکێکیان .

**دووهەم** : کوفری بچوك کە ئەویش کەماڵ و تەواوی دین لە کەدار دەکات و لەناوی ئەبات ، ئەویش کوفرێکی کرداریە و پێچەوانەی قسەو کرداری دڵ نی یە .

## پ١٦٢: ڕوونی بکەرەوە چۆن کوفری بڕواداری پێچەوانەی تەواوی ئیمانە و باس لەوە بکە چۆن کوفر دەبێتە هۆی نەهێشتنی ئیمان ؟

و: وەك لە پێشەوە باسمان کرد ئیمان کردار و گوفتارە ، گوفتاری دڵ و زوبان و ئەندامەکان . گوفتاری دڵ بڕوا بوونە ، گوفتاری زوبان وتنی شایەتمان ، کاری دڵ ، نیەت و دڵسۆزی نواندن و ئیخلاسە ، کاری ئەندامانی لە شیش مل کەچ بوون و جێ بە جێ کردنی کردەوە چاکەکانە .

ئەگەر ئەم چوار شتە نەمێنێ ، کردار و گوفتاری دڵ، گوفتاری زوبان و کردەوەی ئەندامەکانی لەش ئیمان نامێنێت و لە بوون دەردەچێت خۆ ئەگەر بەتەنهاش بڕوا بوونی بە دڵ نەمێنێ بەشەکانی تر سوودی نی یە .

چونکە بڕوا بوون و بە ڕاست زانینی دڵ مەرجی دامەزراندن و سوود مەند بوونیەتی ، نمونەش وەك بە درۆ زانینی ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوا ، یان بە درۆ زانینی هەر شتێك کە خوا بە پێغەمبەرانیدا ناردوویەتی یان لە کتێبەکانیدا نێردراوەتە خوارەوە.

هەروەها گەر کاری دڵ نەما لەگەڵ بەڕاست زانین و بڕوابونیشدا بەهەمان شێوە ئیمان نامێنێت و دەبێتە هۆی لەبن هێنانی ، چونکە بڕوابوون تەنها لە دڵدا سوود ناگەیەنێ ئەگەر کاری دڵی لەگەڵ نەبێت کە ئەویش خۆش ویستن و ملکەچ بوونە بۆی ، هەر چۆن ئیبلیس و فیرعەون و نەتەوەکەی و جولەکە و موشریکەکان بڕوایان هەبوو بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) و دانیان دەنا بە پێغەمبەرایەتی ( محمد ) (ﷺ) ، بەنهێنی و ئاشکرا دەیان وت دەزانین درۆ ناکات و لە لای خواوە نێراوە ، بەڵام ئێمە خۆمان شوێنی ناکەوین و بڕوای پێ ناهێنین .

## پ١٦٣: چەند جۆر کوفری گەورە هەیە کە دەبێتە هۆی دەرچوونی خاوەنەکەی لە ئیسلام ؟

و: چوار جۆر کوفر هەیە کە وا دەکات خاوەنەکەی لە ئیسلام دەربکات ئەویش :-

١-کوفری نەزانین و بە درۆ خستنەوە .

٢-کوفری بە ڕاست نەزانین .

٣-کوفری کەلە ڕەقی و خۆ بە گەورە زانین .

- کوفری دووڕوویی .

**پ١٦٤: کوفری نەزانین و بە درۆ خستنەوە چی یە ؟**

**و:** بریتی یە لە بە درۆ خستنەوەی هەر شتێك کە خواو پێغەمبەر (ﷺ) باسیان لێوە کردووە و نادیار بێت وەك لە قورئان دا هاتووە ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَـٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ غافر: ٧٠ . واتە : ( ئەوانەی کە بڕوایان بە قورئان نىیە و هەروەها بڕوایان نی یە بەو ڕێباز و پەیامانەی کە بە پێغەمبەراندا ناردومانە ، لە پاشەڕۆژدا خۆیان دەبیننەوە چیان بەسەر دێت ) .

﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَـٰهِلِينَ﴾ الأعراف: ١٩٩ .

واتە : ( خۆت لا بدە لە نەفام و تێ نەگەیشتوان ) .

**پ١٦٥: کوفری بێ بڕوایی ( الجحود ) چی یە ؟**

**و:** بریتی یە لە شاردنەوەی حەق و ڕاستی و مل کەچ نەکردن بۆی لە ڕواڵەت دا ،لە کاتێکدا ئەو کەسە ئەزانێت کە حەقە و لە دڵ و دەروونی خۆیدا دڵنیایە لە ڕاستیێتی ئەو دینە ، وەکو بێ بڕوایی فیرعەون و قەومەکەی بەرامبەر موسا ، کوفری جولەکە بە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) ، خوای گەورە دەربارەی کوفری فیرعەون و قەومەکەی دەفەرموێ : ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ النمل: ١٤ . واتە : ( بە ئاشکرایی بڕوایان بە بەڵگەو ئایەتەکانی ئێمە نەدەکرد هەرچەندە لە دەرونیاندا دەیانزانی کە ئەوەی ناردوومان حەقەو ڕاستە بەڵام بڕوایان نەدەکرد لە بەر خۆ بەزل زانین و ستەم کردن لە خۆیان ) وە دەربارەی جولەکەکان دەفەرموێت : ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾ البقرة: ٨٩ .

واتە : ( ئەو پێغەمبەرەی کە لەوەو پێش هەواڵیان هەبوو لە هاتنی کاتێك ئێمە نیگامان بۆ نارد بڕوایان پیَ نەهێناو پشتیان لیَ هەڵکرد ) .

**پ١٦٦: کوفری عیناد و لووت بەرزی چی یە ؟**

**و:** ئەوەیە کە مل کەچی حەق نەبێ ، هەرچەندە ڕاستیش بزانێت ، وەك کوفری ئیبلیس ، کە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت : ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ البقرة: ٣٤ . واتە : ( جگە لە ئیبلیس کە پشتی هەڵکردو لووت بەرزی نواند و یەکێك بوو لە بێ بڕوایان ) . کەواتە ئیبلیس نەیتوانی بێ بڕوا بێت بە فەرمانی خواو ئینکاری بکات ، بەلاَم ڕەخنەی لیَ گرت و کارەکەی خوای بەبێ حیکمەت و ستەم لە قەڵەم دا بۆیە ووتی ﴿ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا﴾ الأسراء: ٦١ . واتە ( ئایا سوجدە بەرم بۆ دروستکراوێك کە لە قوڕ دروستت کردووە ) ، هەروەها ووتی : ﴿لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ﴾ الحجر: ٣٣ . واتە: ( شەیتان ووتی من چۆن کڕنوش بەرم بۆ مرۆڤێك کە لە گڵی ووشك و پێشتر قوڕی ترشاو دروستت کردووە ) .

هەروەها ووتی ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾ الأعراف: ١٢ . واتە : ( من چاکتر و بەڕێز ترم لەو منت لە ئاگر دروستکردووە و ئەویشت لە قوڕ خولقاندووە ) .

**پ١٦٧: کوفری دوو ڕوویی چی یە ؟**

**و:** ئەوەیە کە بەدڵ بڕوای نەبێت ، هەرچەندە بەڕواڵەت هەندیَ ملکەچی دەرببڕێت بۆ ڕیاکردن ، وەکو کوفری ئیبن سەلول و حیزبەکەی ، خوای گەورە دەربارەیان

دەفەرمویت : ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ البقرة: ٨–٩.
واتە : ( لە رابردوو و ئێستادا خەڵکی هەیە دوو ڕووەو بە زوبان ئیسلامەتی ڕادەگەیەنن و لە ناوەڕۆك دا بەو شێوەیە نین و بێ بڕوان بەڵام بە نەزانینی خۆیان دەیانەوێت بەو شێوەیە خوا و موسڵمانان بخەڵەتێنن بەڵام هەست ناکەن کە خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن ) .

## پ١٦٨: کوفری کرداری کامەیە کە مرۆڤ لە دین دەرناکات ؟

و: هەموو ئەو گوناهانەیە کە خوای گەورە ناوی ناوە کوفر لەگەڵ ئەوەی کەناوی ئیمان بەو کەسەوە دەمێنێتەوە و لێ ی داناپڕنرێت ، وەك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت : ( لا ترجعوا بعدی كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( دوای من لە ئیسلام هەڵنەگەڕێنەوە و کافر نەبن بە جۆرێ شەڕ بکەن لە نێوان خۆتاندا و ملی یەکتر بپەڕێنن ) هەروەها ئەم فەرموودەیە : ( سباب المسلم فسوق و قتاله كفر ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : (جنێودان بە موسڵمان لە دین دەرچوونە و شەڕکردن لەگەڵیدا کوفرە ) ، ئەبینین پێغەمبەر (ﷺ) شەڕی نێوان موسڵمانانی ناو ناوە کوفر ، ئەوانەش ئەو کارە دەکەن ناوی ناون کافر ، هەرچەندە خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ ﴾ الحجرات: ٩ . واتە: ( ئەگەر دوو کۆمەڵ و تاقمی موسڵمان بەیەکەوە جەنگیان کرد ) چونکە لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا مرۆڤ بە گوناهی گەورە لە ئیمان دەرناچێت وەك ئایەتەکە ئاماژەی پێ کردووە لەگەڵ بوونی جەنگ لەگەڵ یەکتر هەر بە ئیمانداران

ناویان دەبات ، هەروەها لەئایەتی تۆڵەسەندندا دەفەرموێت : ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾ البقرة: ١٧٨ . واتە : ( هەرکەسێك بە تاوانی کوشتن هەستا دەبێت بکوژرێتەوە بەڵام ئەوەی چاوپۆشی لە براکەی کرد با بکوژەکە چاك ڕەفتار بێت وە با کەس و کاری کوژراوەکەش چاك ڕەفتاربن وە بکوژەکە بە جوانی خوێن بەهای کوژراوەکە بدات ) . سەرنج دەدەین خوای گەورە برایەتی ئیمانی بۆ بڕیارداوە و لێی دانەڕنیوە ، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن ، و لا يسرق حين يسرق وهو مؤمن ، و لا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن ، والتوبة معروضة بعد ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( مرۆڤی زیناکەر کاتێك زینا دەکات ئیماندار نی یە ، وە مرۆڤی دز کاتێك دزیی دەکات ئیماندار نی یە ، وە مرۆڤی عارەق خۆر کاتێك عارەق دەخواتەوە ئیماندار نی یە ، بەڵام دوای ئەوە بۆی هەیە تەوبە بکات ) ، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ( وە کاتێ پیاو کوژ کەسێ دەکوژێ ئیمانی نیە ) لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە : ( ولا ينتهب نهبة ذات شرف يرفع الناس اليه فيها ابصارهم حين ينتهبها وهو مؤمن ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( مرۆڤی داگیرکەر هیچ شتێکی بە نرخ داگیرناکات کە خەڵکی بە لایانەوە جێگەی بایەخ و سەرنج بێت لەو کاتەدا داگیری دەکات بەئیماندار دنانرێت).

هەروەها ئەبوزەر دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) ( مامن عبد قال لا اله الا الله ثم مات على ذلك الا دخل الجنة ) قلت : ( وإن زنى وان سرق ) قال : ( وان زنى وان سرق ) ثلاثا ثم قال في الرابعة ( على رغم أنف أبي ذر ) واتە : ( هەر بەندەیەك بڵێت لا اله الا الله و پاشان لەسەر ئەوە بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ) من ووتم ( ئەگەر زیناش بکا و دزیش بکات ) فەرمووی ( بەڵێ ئەگەر چی زیناش بکاو دزیش بکا ؟! ) سێ جار

ئەمەی دووبارە کردەوە پاشان لە جاری چوارەم دا فەرمووی ( بەڵێ ئەگەرچی ئەبوزەریش پێ ی ناخۆشبێت ) . ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤی زیناکەر و درۆ عەرەق خۆر و پیاو کوژ ئیمانی ( مطلق ) و یەکتا پەرستی لێ دانەڕنیوە ، چونکە گەر بەو شێوەیە نەبوایە نەیدەفەرموو هەرکەس لەسەر ووشەی ( لا اله الا الله ) بمرێت دەچێتە بەهەشتەوە ، گەرچی ئەو گوناهە گەورانەش بکات ، چونکە هەرکەس ئیماندار نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە ، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو کە ئیمانەکەی کەم دەکا و کامڵ نیە ، بەڵام کاتێ بەندە کافر دەبێت بەهۆی ئەو گوناهانەوە کە بە حەڵاڵیان بزانێت و هاوکات ئەو کەسە قورئان و سوونەت بە درۆ دەخاتەوە لە حەرام کردنی ئەو تاوانانەدا . بەڵکو ئەگەر خۆیشی ئەو گوناهە نەکات هەر بەوەندەی بە حەڵاڵیان بزانێت کافر دەبێت .

**پ١٦٩: ئەگەر ووتیان کڕنوش بردن بۆ بت و سوکایەتی کردن بە قورئان و جنێو دان بە پێغەمبەر و گاڵتە کردن بە دین و ئەو شتانە ، هەمووی کوفری کردارین وەك دەردەکەوێت ، ئەی بۆچی مرۆڤ لە دین دەردەکەن لە کاتێکدا کوفری بچوك بە کوفری کرداریی پێناسە دەکرێت ؟**

و: دیارە کە ئەم چوارە و ئەوانەی بەم شێوەیەن تەنها لەو ڕووەوە کوفری کردارین کە بە ئەندامەکانی لاشە دەکرێن ، بەڵام کاتێ جێبەجێ بکرێت کردەوەکانی دڵ بوونیان نامێنێ وەکو نیەت پاکی و دڵسۆزیی و خۆشەویستی و ملکەچی بۆ خوا ، ئەوانە هیچی نامێنن جا هەر چەندە لە ڕواڵەتدا کرداریین ، بەڵام پەیوەستن بە کوفری بیرو بڕواوە ، بۆیە ئەم کردارانە تەنها لە دووڕوویەکی یاخی یان کافرێکی سەرکەشەوە نەبێت لە کەسی تر ناوەشێتەوە ، وە ئایا چی پاڵی نا بە دوو ڕووەکانەوە لە شەڕی ( تبوك ) دا بڵێن ﴿وَلَقَدْ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُواْ بَعْدَ

إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ﴾ التوبة: ٧٤ . واته : ( دوو ڕووەکان گوفتاری کوفر و بێ باوەڕیان هات بەدەمدا ئەوانەی دوای موسلمان بوونیان گەڕانەوە بۆ کوفر خەریکی پیلان و نەخشەیەك بوون کە شەهید کردنی پێغەمبەر بوو بەلام بۆیان نەلواو بۆیان نەکرا ) جگە لەوە هەر چەندە کە پرسیاریشیان لێ کرا ووتیان ﴿إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾ التوبة: ٦٥-٦٦ . واته : ( دوو ڕووەکان دەیان ووت ئێمە گەمەو گاڵتەمان دەکرد بڵێ ئایا ئێوە بە خوا و بەڵگەکان و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد ئیتر بێ سوودە داوای لێ بووردن مەکەن چونکە بە ڕاستی ئێوە کافر بوون هەر چەندە لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنا بوو ) . وە ئێمە کوفری بچوکمان بە کوفری کرداریی بەڕەهایی پێناسە نەکردووە بەڵکو کاتێك کوفری کردارییە کە پەیوەست بێ بە بیر و بڕوا و پێچەوانەی ووتەو کردەوەی دڵ بێت .

**پ١٧٠: ستەم و لە فەرمانی خوا دەرچوون و ( الفسوق ) دووڕوویی ئەکرێن بە چەند بەشەوە ؟**

**و:** هەر یەکێکیان ئەکرێن بە دوو بەشەوە : گەورە کە کوفرە ، بچوك کە لە خوار ئەوەوەیە .

**پ١٧١: نموونەی ستەمی گەورەو بچوك چی یە ؟**

**و:** نمونەی ستەمی گەورە ، ئەوەیە کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی کردووە :

﴿وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ یونس: ١٠٦

واتە : ( هاناو هاوار نەبەیت بۆ هیچ شتێك جگە لە خوا نەبێت چونكە نە قازانجت پێ دەگەیەنێت و نە زیان خۆ ئەگەر كاری وا بكەیت ئەوە ئیتر تۆ لە ریزی ستەمكارانی).

هەروەها دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾ لقمان: ١٣ ، واتە : ( بەڕاستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا ستەمێكی زۆر گەورە و ناڕوایە ) .

وە لە ئایەتێكی تردا هاتووە ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ﴾ المائدة: ٧٢ ، واتە : ( دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیاڕ بدات ئەوە خوا بەهەشتی لەسەر حەرام كردووە و شوێن و جێگای ئەو كەسە دۆزەخە ) .

نمونەی ئەو ستەمەی لە خوار ئەوەوەیە ئەم ئایەتەیە كە خوای گەورەدەربارەی تەلاق دەفەرموێت : ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥ﴾ الطلاق: ١ ، واتە : ( لە خوا بترسن دەریان مەكەن لەماڵەكانی خۆیاندا ئافرەتەكانیش با بە بێ ڕەزامەندی مێردەكانیان با لەماڵ دەرنەچن مەگەر كارێكی ناشرین و ناڕەوای ئاشكرایان ئەنجام دابێت ئەوە سنووری خوایە و هەر كەس لە سنووری خوا بترازێت ئەوە ستەم لە خۆی دەكات ) .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلَا تُمۡسِكُوهُنَّ ضِرَارٗا لِّتَعۡتَدُواْۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥ﴾ البقرة: ٢٣١ ، واتە : ( مەیان هێڵنەوە لەلای خۆتان بۆ ئەوەی ئازاریان بدەن یان دەست درێژی بكەنە سەریان ئەوەی كاری وا بكات ئەوە ستەمی لە خۆی كردووە ) .

**پ۱۷۲: نموونەی لەفەرمان دەرچوون ( الفسوق )[14] ی گەورەو بچوك چی یە ؟**

**و:** نمونەی لەفەرمان دەرچوونی گەورە ئەوەیە کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی کردووە : ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ التوبة: ٦٧ ، واتە :( بەڕاستی دوو ڕووەکان تاوانبار و گوناهبارن ) .

هەروەها دەفەرمویت : ﴿إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ﴾ الكهف: ٥٠ ، واتە : ( هەموو فریشتەکان گوێ ڕایەڵی خوا بوون تەنها ئیبلیس نەبێت کە لە دەستەی جنۆکەکان بوو لە فەرمانی پەروەردگاری یاخی بوو ) .

ئەم ئایەتە : ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ﴾ الأنبياء: ٧٤ ، واتە : ( ڕزگارمان کرد پێغەمبەر لوط لەو شارۆچکەیەی نێربازیان دەکرد بێگومان ئەوانە نەتەوەیەکی نالەبار و خراپ و بەد کار بوون ) .

نموونەی ئەو لەفەرمان دەرچوونە خوار ئەویشەوە ئەم ئایەتەیە کە دەربارەی بوختان هەڵبەستن هاتووە ﴿وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ النور: ٤ ، واتە : ( هەرگیز شایەتیان لێ وەر مەگرن ئەوانە لە ڕیزی فاسیق و تاوانبار و یاخی یەکاندان ) .

هەروەها لەم ئایەتەدا دەفەرمویت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ﴾ الحجرات: ٦ ، ڕیوایەت کراوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی وەلید کوڕی عوقبە هاتووەتە خوارەوە ، واتە : ( ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێ نەکراو هەواڵێکی بۆ هێنان خێرا بڕوای

---

[14] فاسق : لە بچینەدا لە ( فسق )ە وە هاتووە لە بنەڕەتدا ئەگەر دەنکی خورما لە توێکڵی خۆی دەرچوو پێی دەڵێن ( فسق ) و ماناکەی واتە( ئەنجام دانی گوناه ، چ بچوك یان گەورە )ئەو کەسەی گوناه دەکات (فاسق)ە.

پێ مەکەن بەڵکو لێ ی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە نەوەك کێشە و ناخۆشی و گێروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بەنەزانی و دوایی پەشیمان ببنەوە لەو تاوانەی کە پێ ی هەستاون ) .

**پ١٧٢: نموونەی دووڕوویی گەورە و بچوك کامەیە ؟**

**و:** نموونەی دووڕوویی گەورە ، ئەو ئایەتانەی کە لە سەرەتای سورەتی (البقرة) هاتووە وە هەروەها لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ النساء: ١٤٥ ، واتە : ( بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان وە هەرگیز نابینی کەسێك پشتیوانیان لێ بکات و بە هانایانەوە بچێت ) . هەروەها لەم ئایەتەدا خوای زاناو دانا دەفەرموێت : ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾ المنافقون: ١ .

واتە : ( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك دووڕووەکان دێن بۆ لات دەڵێن : ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت لە کاتێکدا کە خوا خۆی چاك دەزانێت کە تۆ پێغەمبەر و نێردراوی ئەویت لە هەمان کاتدا خوا شایەتە کە ئەو دوو ڕووانە درۆ دەکەن بڕوایان بە تۆ نی یە ) .

وە نمونەی ئەو دووڕوویی یەی لە خوا ئەوەوەیە ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی پێ کردووە ( آية المنافق ثلاث : أذا حدث كذب ، واذا وعد أخلف ،وأذا ائتمن خان ) ئیمام بوخاری و موسایم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( نیشانەی دووڕوویی سیانە ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکا ، ئەگەر بەڵێنی دا نایباتە

سەر وەئەگەر ئەمانەتی لا دانرا خیانەتی لێ دەکات ) ، هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت : ( أربع من كن فيه كان منافقا ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە :( چوار خەسڵەت هەیە هەرکەس تیایدا بن ئەوا دوو ڕووە).

## پ١٧٤: حوکمی جادوو جادوگەر چی یە ؟

**و:** سیحر وجودی هەیە و ڕاستە ، کاریگەری یەکەشی ئەوەیە یەك بگرنەوە بکەوێت لەگەڵ قەدەری گەردوونی وەك لەم ئایەتەدا هاتووە ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ البقرة: ١٠٢ ، واتە : ( لەو فریشتانە شتی وا فێردەبوون کە ژن و مێردی لەیەك جودا بکەن هەر چەندە ئەو جادوگەرانە ناتوانن زەرەرێك بە مرۆڤ بگەیەنن مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت ) .

## پ١٧٥: سزای شەرعی جادووگەر چی یە ؟

**و:** ئیمامی تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە و دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( حد الساحر ضربه بالسيف ) واتە : ( سزای شەرعی ساحیر کوشتنیەتی بە شمشێر ) ، پاشان ئاماژە دەکات بەوەی ، هەندێ لە زانایانی صەحابە و جگە لەوانیش کاریان بەم فەرموودەیە کردووە ، وە ئەمە ووتەی ( مالك بن أنس )ە و ئیمام شافیعی دەفەرموێت : ( ساحیر کاتێك دەکوژرێت کە سیحرەکەی بگاتە پلەی کوفر بەڵام ئەگەر نەگاتە پلەی کوفر ناکوژرێت ، چەند کەسێك لە صەحابە و تابعی یەکان ساحیریان کوشتووە وەکو ئیمامی عومەر ، وە عبدالله ی کوڕی ، وە حەفسەی کچی، وە عوسمانی کوڕی عەفان و جوندوبی کوڕی کەعب و عومەری کوڕی عبدالعزیز و ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی ئەبو حەنیفە و گەلێکی تریش(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)).

## پ١٧٦: هەڵوەشاندنەوە چی یە و حوکمی لە شەرعدا چۆنە ؟

و: واتە کردنەوەی سیحر لە سیحر لێ کراوەکە ، جا ئەگەر بە سیحرێکی وەکو خۆی کردیەوە ئەوە کاری شەیتانە ، وە ئەگەر بە دوعاو نوشتەی شەرعی بوو ، ئەوا دروستە .

## پ١٧٧: نوشتەی شەرعی چی یە ؟

و: ئەوەیە کە لە قورئان و سوونەت وەرگیرابێت ، بە زمانی عەرەبی بێت ، و ئەو کەسەی نوشتە دەکات و ئەوەش کە بۆی دەکرێت بڕوایان وابێت کە کاریگەریی نابێت مەگەر بە مۆڵەتی خوا نەبێت ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) جوبرائیل نوشتەی بۆ کردووە ، خۆیشی بۆ زۆر لە هاوەڵانی کردووەو لەوانەشی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعا و نوشتەی بەسەرا خوێندون حەسەن و حوسەینی کچەزای بوون دەیفەرموو ئەم دوعایە باوکتان إبراهیم دەیخوێند بەسەر ئیسماعیل و ئیسحاقدا ( أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة ومن كل عين لامة ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( پەنا دەگرم بە ووشە تەواوەکانی خوا لە هەموو شەیتانێکی مرۆڤ و پەری وە لە هەموو ژەهرێکی کوشندە و لە هەموو چاوێکی ناپاک ) وە ڕازی بووە ئەوانیش بیکەن .

## پ١٧٨: نوشتەی قەدەغەکراو کامەیە ؟

و: ئەوەیە کە لە قورئان و سوونەت وەرنەگیرابێت ، وە بە زمانی عەرەبی نەبێت ، بەڵکو لە کردەوەکانی شەیتان بێت و بە شتێك بکرێت کە شەیتان پێ ی خۆش بێت، هەروەك و زۆربەی جادوگەرو بەناو زانا دەیکەن ، لە چەند پەڕاوێکی وەك ( شمس المعارف و شموس الأنوار ) و چەندین کتێبی دی بابەتەکان دەردەهێنن کە دوژمنانی

ئیسلام هێناویانته ناو موسڵمانانەوە و پێچەوانەی ئاینی ئیسلامە ، و هیچ پەیوەندیەکی بە زانستە شەرعی یەکانەوە نیە ، هەروەك لە کتێبی ( شرح المسلم ) و ئەوانی تریش دا ڕوون کراوەتەوە .

**پ١٧٩: حوکمی ئەو شتانە چی یە کە دەکرێن بەسەر شانی منداڵ و نەخۆش و ...شتد ، یان ئەو بازن و پەت و موروانەی بەکاردێن ؟**

و: لە هەندێ لە گەشتەکانی دا ، پێغەمبەر (ﷺ) نوێنەرێکی خۆی نارد و فەرمووی ( أن لا يبقين في رقبة بعير قلادة من وتر أو قلادة الا قطعت ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( لەملی هەر ووشترێکدا هەر ملوانکەیەك هەبوو بیپچڕێنەو فرێی دە ) ، هەروەها دەفەرموێت : ( ان الرقى والتمائم والتولة شرك ) ئیمام ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( ئەو نوشتانەی بە شتی نادروست بکرێن یان مانا نەگەیەنێت و مۆرو هەروەها نوشتەی ڕەش و سپی بە شیرك دادەنرێت ) .

**پ١٨٠: حوکمی هەڵواسینی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان چی یە ؟**

و: هەڵواسینی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان بە مرۆڤەوە بێت یان هەر گیاندارێکی ترەوە بێت هەندێك لە زانایانی سەلەف بە دروستی دەزانن و زۆربەیان قەدەغەیان کردووە و بەباشی نازانن وەك عبدالله ی کوڕی مەسعود و عبدالله ی کوڕی حەکیم و عبدالله کوڕی عەمر وە نەکردنیشی باشترە ، چونکە زۆر جار دەبرێتە شوێنی پیسەوە وەهەروەها ڕێگە گرتن لەوەی دڵەکان جگە لە خوا ڕوونەکەنە هیچ شتێکی تر بە تایبەتیش لەم چەرخەدا کە خەڵکی زۆر بە پەرۆشن کار بە شتی نا دروست بکەن .

**پ١٨١: حوكمی فالچی ( كهان ) چی یه ؟**

**و:** فالچی یەكان بەشێكن لە تاغوتەكان و دۆستی شەیتانەكانن كە ئاراستەیان دەكەن ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ﴾ الأنعام: ١٢١ ، واتە : ( دڵنیابن كە شەیتانەكان شت دەخەنە دڵی دۆستەكانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بكەن و بەرگری لە ناحەقی خۆیان بكەن ) . وە دادەبەزن بۆلایان و ووشەیەك لەو وشانەی لە فریشتەكانیان بیستووە پێ یان دەگەیەنن ئەوانیش سەد درۆی پێوە دەنێن هەروەك خوای گەورە باسیان دەكات و دەفەرموێت: ﴿هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ الشعراء: ٢٢١ ، واتە : ( ئایا پێتان بڵێم كە شەیتانەكان دادەبەزنە سەر كێ ؟ دادەبەزنە سە كەسانێكی بوختان چی و تاوانبار و گوناهكار جادوگەران گوێ بۆ شەیتانەكان دەگرن و زۆربەشیان درۆزنن)).

لە فەرموودەیەكدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( فیسمعها مسترق السمع و مسترق السمع هكذا بعضه فوق بعض فیلقیها الی من تحته ثم یلقها الآخر الی من تحته حتی یلقیها علی لسان الساحر أو الكاهن فربما لأدركه الشهاب قبل أن یلقیها وربما ألقاها قبل أن یدركه فیكذب معها مائة كذبة ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی كردووە . واتە : (ئەو شەیتانەی بەرز بووەتەوە بۆ ئاسمان هەواڵێك دەبیستێت و دەیزانێت ئەویش دەیگەیەنەتە شەیتانەكانی تر بەم شێوەیە هەندێكیان كە لەسەر و هەندێكیانەوەن هەواڵەكە دەگەیەنە ئەوانەی خوار خۆیان هەتا دەگاتە سەر زمانی ساحیرێك یان فالچی یەك لەوانەیە نیازكێكی بەركەوێت پێش ئەوەی بیگەیەنێتە ئەوانی تر یاخود لەوانەیە بیگەیەنێت پێش ئەوەی نیازكەكەی بەركەوێت و لە گەڵیدا سەد درۆ ڕێك دەخات ) .

**پ١٨٢: حوكمی ئەو كەسە چی یە كە قسەی فاڵچی بەڕاست دەزانێت ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ النمل: ٦٥ ، واتە : ( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ : جگە لە خوا هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی یدا هەیە هیچیان ئاگادارنین لە غەیب و نهێنی و شاراوەكانی ئەم گەردوونە ) .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ﴾ الأنعام: ٥٩ ، واتە : ( كلیلی هەموو شاراوەكان و زانینی هەموو نهێنیەكان بەدەست خوایەو لای ئەوە ) .

هەروەها دەفەرموێ : ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ البقرة: ٢١٦ ، واتە : (بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت ( خێر لەچی دایە ) ، ئێوە نایزانن و ئاگاداری و نهێنی و ئاشكراكانی ئەم گەردوونەیە ) .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( من أتى عرافا أو كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما أنزل على محمد ) ئیمام ئەبو داود ڕیوایەتی كردووە ، واتە : ( هەر كەسێ بچێتە لای فاڵچی یەك و قسەكەی بە ڕاست بزانێ ئەوە كافر بووە بەو قورئانەی خوای گەورە دایبەزاندووەتە سەر محمد ) ، هەروەها دەفەرموێت : ( من أتى عرافا فسأله عن شئ فصدقه لم تقبل له صلاة أربعين يوما ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی كردووە . واتە : ( هەر كەسێ بچێتە لای فاڵچییەك و پرسیاری شتێكی لێ بكا و بڕوا بە قسەكانی بكات چل ڕۆژ نوێژی لێ قبوڵ ناكرێت ) .

**پ١٨٢: حوكمی ئەستێرەناسی گەری چی یە ؟**

**و:** خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ﴾ الأنعام: ٩٧ . واتە : ( هەر ئەو زاتەیە ، ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێناون تا ببێتە هۆی ڕێنموییتان لە تاریکستانی سەر ڕووکاری ووشکانی و دەریاکاندا ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾ الملك: ٥ ، واتە : ( بێگومان ئێمە ئاسمانی دونیامان کردووە بە چراخان – بەهۆی ئەستێرەکانەوە کە بەشەو گاردا بەدی دەکرێن – وە بەو ئەستێرانە شەیتانەکان ڕاو دەکەین ) .

وە دەفەرموێت : ﴿وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾ النحل: ١٢ ، واتە : ( ئەستێرەکانیش بەفەرمانی ئەو ڕامێنراون ) . پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( من أقتبس شعبة من النجوم فقد أقتبس شعبة من السحر زاد ما زاد ) ئیمام ئەبو داوود ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( هەر کەسێك وەربیگرێت بەشێك لە ئەستێرەناسی ئەوە بەشێکی لە سیحر وەرگرتووە ، سیحرەکە زیاد دەکات بە زیاد بوونی فێربوونەکەی )

عەبدڵلای کوڕی عەباس ( خوا لێیان ڕازی بێت ) دەربارەی ئەو کەسانەی نوشتە دەنوسن و ئەستێرە ناسی دەکەن دەڵێت ( کەسێ ئەو کارانە بکات پێم وایە لای خوای گەورە هیچ نرخ و ڕێزێکی نی یە ) ، قەتادە ( ڕەحمەتی خوای لێ بێت ) دەڵێت : ( خوای گەورە ئەم ئەستێرانەی بۆ سێ مەبەست دروست کردووە جوانی یەکە بۆ ئاسمان و ڕەجم کردنی شەیتانەکان و چەند نیشانەیەکن کە خەڵکی ڕێیان پێ دەردەکەن ، جا هەرکەسێ بۆ لێکدانەوەی شتێکی تر بەکاری بهێنێ ئەوا تاوانی کردووە ) .

**پ١٨٤: حوکمی داوا کردنی باران بە بورج و ئەستێرەکان چی یە ؟**

**و: خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ الواقعة: ٨٢ ، واتە : ( لەباتی ئەوەی سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو ڕۆزییەی کە بە خشیویەتی درۆ دەکەن و دەڵێن بە هۆی فلانە ئەستێرەوە بارانمان بۆ باریوە ) .**

**وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت : ( أربع في أمتي من أمر الجاهلية لا يتركونهن : الفخر با لأحساب والطعن في الأنساب و الأستسقاء بالأنواء و النياحة ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( چوار شت لە ئوممەتەکەمدا هەیە لە عادەتی نەفامین و تەرکی ناکەن : خۆ نواندن بە حەسەب و بنەماڵە ، و جنێو دان و تانە و تەشەر لە باو باپیران ، و داوا کردنی ڕزق و ڕۆزی و باران لە ئەستێرەکان ، و شیوەن کردن بۆ مردوو ) ، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت : ( قال الله تعالى : أصبح من عبادي مؤمن بي و كافر فأما من قال مطرنا بفضل الله ورحمته فذلك مؤمن بي و كافر بالكوكب ، وأما من قال مطرنا بنوء كذا و كذا فذلك كافر بي و مؤمن بالكواكب ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە: ( خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمویت : بەندەکانم هەندێکیان ئەمڕۆ ئیماندارن و هەندێکیان کافرن ، ئەو کەسەی ووتی لە سایەی ڕەحم و بەزەیی خواوە بارانمان بۆ باری ئەوە ئیمانی هەیە بە من و بێ بڕوایە بە ئەستێرە، ئەوەش کە ووتی بە هۆی فلان ئەستێرە و بورجەوە باران باری ئەوە کافرە بە من و باوەڕی بە ئەستێرەهەیە).**

**پ١٨٥: بەیدووم ( الطيرة )[١٥] حوكمی چی یە و بە هۆی چی یەوە نامێنێ ؟**

**و:** خوای پەروەردگار دەفەرموێت : ﴿أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾ الأعراف: ١٣١ ، واتە : ( لە كاتێكدا هەموو ئەو شتانەی ئەوان بە شوومیان دەزانی تاقی كردنەوە بوو بۆ بەندەكان لەلایەن خواوە بڕیاڕی لەسەر درابوو ) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( لا عدوى ولا طيرة ولا هامة ولا صفر ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی كردووە . واتە : ( درمو پەتا نیە ، بەیدووم ڕاست نیە ، بەیدووم بەهۆی مانگی سەفەروە ڕاست نیە ) . هەروەها دەفەرموێ : ( الطيرة شرك ، الطيرة شرك ) ئیمام ئەحمەد و حاكم ڕیوایەتیان كردووە ، واتە : ( بەیدووم شیركە ، بەیدووم شیركە ) ، ئیبن مەسعود دەڵێت : ( وما منا الا ولكن الله يذهبه بالتوكل ) ، واتە : ( هەموو یەكێك لە ئێمە خەڵاتی بۆ دروست دەبێت ، بەڵام بە هۆی پشت بەستنەوە بە خوا نامێنێت ) .

**پ١٨٦: حوكمی چاو پیسی لە شەرعدا چۆنە ؟**

**و:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( العين حق ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان كردووە . واتە : ( چاو پیسی ڕاستە و حەقیقەتی هەیە ) ، پێغەمبەر (ﷺ) كەنیزەكێكی بینی ڕوخساری تێك چوو بوو ، فەرمووی ( استرقوا لها فان بها النظرة )

---

[١٥] ( الطيرة ) بەیدووم واتە : ( التشاؤم ) : واتە ڕەشبینی ، ناوەكەی لە ( طيرة ) هوە هاتووە واتە باڵندە ، چونكە عەرەبەكان بە هاتووچۆی باڵندەكان و هەڵفڕینیان بەلای ڕاست و چەپدا ڕەشبینیان بۆ دروست دەبوو لە مەبەستەكانیان پەشیمان دەبوونەوە ، پێغەمبەریش (ﷺ) كاریگەری ئەو باڵندانەی بە بەتاڵ لە قەڵەم دا كە هیچ زیان و سوودێكیان نیە ئێستەش خەڵكی بە گشتی ڕەشبین دەبن بە دەنگی قەلە ڕەش و كونە پەپوو...هتد كە ئەوە كارێكی نادرووستە .

ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە . واتە : ( دوعاو نوشتەی بۆ بکەن چونکە چاوی پیس کاری تێکردووە ) .

عائیشە ( خوای لێ ڕازی بێت ) دەفەرموێت : ( أمرني النبي (ﷺ) أو أمر النبي (ﷺ) أن يسترقي من العين ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردم یان فەرمانی کرد کە دوعا و نوشتە بکرێت بۆ ئەو کەسەی چاوی پیس کاری تێکردووە ) هەروەها پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) دەفەرموێت: ( لا رقية الا من عين أو حمة ) ئەبو داوود و تەرمزی ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( نوشتە تەنها بۆ دووشت دەکرێ : بۆ کەسێك چاوی پیس کاری تێ کرد بێت یان ژەهر ) .

ئەم فەرموودانە هەموویان ( صحيح )ن و چەندین فەرموودەی تریش لەو بارەیەوە هەیە ، وە ئەبێ ئاگاربین ، چاو کاریگەری نیە ئەگەر مۆڵەتی خوای لە سەر نەبێت ، وە ئەم ئایەتەش هەر بەمانای کاریگەری چاو تەفسیر کراوە لە لایەن زۆر لە پێشینە صالحەکانمانەوە ( خوایان لێ ڕازی بێت ) . ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ﴾ القلم: ٥١ ، واتە ( ئەی پێغەمبەر (ﷺ) !! ئەوانەی کە بێ باوەڕ و کافرن بە جۆرێك تەماشات دەکەن و خێسەت لێ دەکەن ، هەر بیانەوێت بە تیلەی چاویان لەناوت بەرن ، بەتایبەت کاتێك کە گوێیان لە ئایەتەکانی قورئان دەبێت ) .

## پ١٨٧: گوناهو تاوان دەکرێن بە چەند بەشەوە ؟

و: دەکرێن بە دوو بەشەوە گوناهە بچوکەکان : کە بە خراپە ناو دەبرێت ، و گوناهە گەورەکان : کە بە ( موبقات )(لە نێو بەرەکان) ناو دەبرێت .

## پ١٨٨: مرۆڤ چۆن لە تاوانەکان خۆی پاك دەکاتەوە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا﴾ النساء: ٣١.

واتە : ( گەر واز لە گوناهە گەورەکان بهێنن ئەوەی خوا قەدەغەی کردووە لێتان لە پاداشتی ئەوەدا تاوانە بچوکەکانتان بۆ دەسڕینەوە و پاکتان دەکەینەوە لە خراپە و ئەتان خەینە بەهەشتەوە ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود: ١١٤ . واتە : ( بێگومان چاکەکان خراپەکان دەسڕێتەوە ) خوای گەورە ئاگاداری کردووین کە بە وازهێنان لە گوناهە گەورەکان و چاکە کردن خراپەکانمان دەسڕێتەوە و پاك دەبینەوە .

لەفەرموودەیەکی پێغەمبەری خواشدا (ﷺ) هاتووە : ( واتبع السيئة الحسنة تمحها ) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە .

واتە : ( بەشوێن خراپەیەکدا چاکەیەك بکە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە و خۆت پاك بکەیتەوە ) ، هەروەها لە زۆر لەفەرموودەکان هاتووە کە بەدەست نوێژ گرتن و ڕۆشتن بەپێ بۆ مزگەوت و نوێژکردن لەکاتی خۆیدا ، لەنوێژەکەوە بۆ نوێژێکی تر و لە جومعەیەکە بۆ جومعەیەکی تر و لە مانگی ڕەمەزانەوە بۆ مانگی ڕەمەزانی تر و شەو نوێژ و ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا و چاکە کردن هۆکارن بۆ هەڵوەرینی خراپەکان و خۆ پاك کردنەوە لە هەڵەکان بەڵام زۆربەی ئەو فەرموودانەش ئەم مەسەلەیە پەیوەست دەکەن بە دوورکەوتنەوە لە گوناهە گەورەکان .

**پ١٨٩: گوناهە گەورەکان کامانەن ؟**

**و:** لە دیاری کردن و ژمارەکردنیدا قسەی زۆر لەسەر کراوە لەلایەن هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێن کەوتوان و زانایانەوە ، لەوانەش ووتراوە . گوناهی گەورە ئەوەیە کە سزای لەسەر بێت ، هەروەها وتراوە : گوناهی گەورە ئەوەیە خوا لەعنەتی لەخاوەنەکەی کردبێ یان لێی توڕە ببێت یان سزای ئاگری بۆ دانابێ یان سزایەکی بەرانبەری بۆ دانابێ ، یان هەر گوناهێك کە هەست بکرێت خاوەنەکەی ترسی خوای لەدڵدا نی یە بە گوناهی گەورە دادەنرێت ، لە فەرموودە ڕاست و دروستەکان ئاماژە کراوە بۆ زۆر تاوان و گوناهی گەورە ، هەیانە کوفری گەورەیە وەك شەریك بۆ خوا قەراردان – جادوگەری – یان هەیانە گوناهی زۆر گەورەن بەڵام ناگاتە ڕادەی کوفر وەك کوشتن ، هەڵهاتن لە کاتی جیهاددا ، سوخواردن ، خواردنی ماڵی هەتیو ، قسە هەڵبەستن ، عەرەق خواردن ، تاوانبارکردنی ئافرەتانی داوێن پاکی موسڵمان ، ئازاردانی دایك و باوك ، ئیبن عەباس دەڵێت : گوناهە گەورەکان لە حەفتاوە نزیکترە لە حەوت ، ئەگەر سەرنج و تێبینی ئەو گوناهانە بدەین کەبە گەورە ناو براوە لە حەفتا زیاترە چ جای ئەو تاوان و گوناهانەی کە هەڕەشەیان دەربارە هاتووە ، یان لەعنەت و تووڕەبوون و هەڕەشەی ئاگری لەسەر کراوە ئەو کاتە دەبینین گوناهەکان ژمارەیان زۆر دەبێت .

**پ١٩٠: گوناهی گەورە و خراپەی بچوك بەچی دەسڕێتەوە ؟**

**و:** هەموو گوناهو خراپەکان بەتەوبەیەکی ڕاستەقینە و دڵسۆزانە دەسڕێتەوە خواه گەورە دەفەرموێت : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾ التحريم: ٨ .

واتە : ( ئەی ئەوانەی بڕوا هێناوە تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خواو تەوبەیەکی ڕاست و پاك بکەن ، بەڵکو خوا بەهۆی ئەو تەوبەیەوە گوناهەکانتان وخراپەکانتان بسڕێتەوە و بتان خاتە بەهەشتێکەوە کە لە ژێریەوە ڕووبار تێ دەپەڕێت ) .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ الفرقان: ٧٠ .

واتە : ( ئەوانەی کە تەوبە دەکەن و کاری چاك ئەنجام دەدەن ئەوانە خوای گەورە خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە ) ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێت : ( لله افرح بتوبة عبده من رجل نزل منزلا وبه مهلكة و معه راحلته عليها طعامه و شرابه فوضع رأسه فنام نومة فأستيقظ و قد ذهبت راحلته حتى اشتد عليه العر و العطش او ماشاء الله قال ارجع الى مكاني فرجع فنام نومة ثم رفع رأسه فاذا راحلته عنده ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( خوای گەورە تەوبەی بەندەکانی پێ خۆشترە لە پیاوێك لە شوێنێکدا باری خۆی دەخات و ماندووە و وڵاخێکی پێ یەو ئاو خواردنەکەی لەسەریەتی — کەمێك دەخەوێت و کە هەڵدەستێتەوە دەبینێ وڵاخەکەی ڕۆیشتووە ، دەست دەکات بەگەڕان بەشوێن وڵاخەکەیدا تا گەرماو تینویەتی تینی بۆ دەهێنێ کە ماندوو دەبێت دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی و خەوی لێ دەکەوێت کاتێك هەڵدەستێتەوە دەبینێت وڵاخەکەی هاتوەتەوە و لە لایەتی ) چەند ئەو کەسە بەو حاڵە دڵخۆش دەبێت خواش ئەوەندە خۆشحاڵە بە تەوبە کردنی بەندەکانی لە پاش گوناهو خراپە کردن) .

## پ١٩١ ( التوبة النصوح ) گەڕانەوەی ساغ چی یە ؟

و: بریتی یە لەتەوبە کردنێکی ڕاستەقینە و سێ مەرجی تێدا کۆبێتەوە :—

١-خۆ دارنین لە گوناهەکە .

٢-پەشیمان بوونەوە لە کردنی .

٣-عەزیمە بوون بۆ نەگەڕانەوە بۆ ئەو گوناهە .

٤-خۆ ئەگەر گوناهەکەش حەقی مرۆڤێکی تێدا بێت ئەوە تا دەتوانیت ئەبێت ئەو حەقە بگەڕێنیتەوە ، چونکە لە قیامەتدا داوای لێ دەکرێتەوە ئەگەر لە دونیادا خۆیی لێ ڕزگار نەکات لە قیامەتدا لە تۆڵەیدا حەقی لێ دەسێنرێت ، لەبەر ئەوەی خوا لە حەقی بەندەکانی نابورێت و داوا دەکرێتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمویت : ( من کان عنده لأیخهِ مظلمة فلیتحلل منه الیوم قبل ان لا یکون دینار ولا درهم ان کان له حسنات أخذ من حسناته و الا أخذ من سیئات أخیه فطرحت علیه ) ئیمام بوخاری و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( هەر کەسێکتان حەقی برایەکی بەلاوەیە خۆی لێ دەرباز بکات و بیگەڕێنێتەوە تا ڕۆژێك نەهاتووە دینار و درهەم کەڵکی نامێنێت و ئەگەر چاکەی هەبێت لە چاکەکانی وەردەگیرێت و دەدرێت بە خاوەن حەقەکە و ئەگەر چاکەشی نەبوو لەخراپەی ماف خوراوو دەهێنرێت دەدرێت بەسەر ئەو کەسەدا حەقی لەسەرە) .

**پ١٩٢: چ کاتێك تەوبە کردن وەرناگیرێت لە تاکەکان و بوار نامێنێت بۆ گەڕانەوە و تەوبە کردنی بەندەکان بۆ لای خوا ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ النساء: ١٧ .

واتە : ( تەوبە کردن لەلای خوا وەردەگیرێت لەو کەسانەی کەبەنەزانی خراپەیەك ئەنجام دەدەن و پێش هاتنە پێشەوەی مردن تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە لای خوا ئەوە خواتەوبەیان لێ قبوڵ دەکات و خوا زاناو کاربەجێیە ) .

هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەوە کۆکن کە هەر کەسێك تاوان و خراپەیەك ئەنجام بدات ئەوە بەنەزان دادەنرێت ئەگەر بە عەمدیش کردبێتی یان بەشێوەیەکی تر بێت ، وە هەر کاتێك فریشتەی گیان کێشان ئامەدە بوو ، ڕۆح گەیشتە بینەقاقەی مرۆڤ و کەوتە پەل هاویشتن ئەو کاتە تەوبەکردن وەرناگیرێت و سودی نی یە بۆ خاوەنەکەی وەك خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾ ص: ٣ . واتە : ( ئە کاتە کاتی ڕزگاربوون و دەرباز بوون نی یە ) ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ﴾ النساء: ١٨ . واتە : ( توبە لەوانە وەرناگیرێت کە خراپە کاری دەکەن تا دەگەنە حاڵەتی مردن و ئەو کاتە دەڵێن وا ئێستا توبە دەکەین و دەگەڕێینەوە بۆ لای خوا ) .

**پ١٩٣: چ کاتێك بوار نامێنێت بۆ تەوبە کردن لە ژیانی دونیادا ؟**

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَـٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَـٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَـٰنِهَا خَيْرًا﴾ الأنعام: ١٥٨ .

واتە : ( لە ڕۆژێکدا کە هەندێك لە نیشانەکانی قیامەت بە دەرکەوت وەك هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاوا لەو کاتەبەدواوە تەوبە وەرناگیرێت و ئیمان هێنان لەوکاتەدا هیچ

سوود بەخاوەنەکەی ناگەیەنێت ئەگەر لەوەو پێش بڕوای نەبوو بێت یان کاری چاکەی نەکردبێت ) .

هەروەها پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێت : ( لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها فاذا طلعت وراها الناس أمنوا أجمعين و ذلك حين لا ينفع نفسا ايمانها ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( قیامەت هەڵناسێت تا ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت و کاتێك هەڵدێت و خەڵکی دەبینێت هەموو بەیەك جار بڕوا بەخوا دەهێنن و موسڵمان دەبن بەڵام لەو کاتەدا بڕوا هێنان و موسڵمان بوون هیچ سودێکی نامێنێت ) .

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( ان الله فتح بابا قبل المغرب عرضه سبعين عاما للتوبة لا يغلق حتى تطلع الشمس منه ) ئیمام تەرموزی و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( خوای گەورە دەرگایەکی کردووەتەوە بۆ تەوبەکردن لە ڕۆژئاواوە پانی یەکەی حەفتا ساڵە ڕێ یە داناخرێت هەتا ڕۆژی لێوە هەڵنەیەت ) .

**پ١٩٤: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە یەکتا پەرستە بەڵام سوورە لەسەر کردنی گوناهێکی گەورە ؟**

**و:** خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ الأنبياء:٤٧ .

واتە : ( تەرازووی دادوەر دادەنێین بۆ ڕۆژی قیامەت و هیچ گیانێك ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر کارێك بەقەدەر تۆوی خەرتەلەش بێت دەیهێنین و دەیخەینە تەرازووەوە ئێمەش بەسین بۆ حیساب کردن لەگەڵ مردووەکاندا ) تێبینی / (ئێمە

دایدەنێین تەرازووەکانی دادپەروەری (کە کردەوەی پێ دەکێشرێت ) لە ڕۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەس ستەمی لیٚ ناکریٚ با قورسی کردەوەکەی بەقەدەر تۆوە خەردەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین وە بەسە کە ئێمە (خوا) ژمێریاری کردەوەی بەندەکانی بیت) تەفسیری پەختەی تەفسیرە..

هەروەها دەفەرموێت : ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ٨﴾ الزلزلة: ٧-٨ . واتە : ( هەرکەسێك کارێکی چاك بکات بابەقەدەر گەردیلەیەکیش بێت دەیبینێتەوە ، و هەرکەسیش کاری خراپ بکات بابەقەدەر گەردیلەیەکیش بێت دەیبینێتەوە ) .

لەم ئایەتانەوە هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و قسەو ڕای پێشینەکانمان و پێشەوایانی تەفسیر و فەرموودەوە بۆمان دووپات دەبێتەوە کە تاوانباران لە ئەهلی ئیمان و یەکتا پەرستی سێ جۆرن :

یەکەم : کۆمەڵێکن کە لە تەرازووی قیامەتدا چاکەکانیان زیاترە لە خراپەکانیان ئەوانە دەڕۆنە بەهەشت و بەهیچ جۆرێك ئاگر نزیکیان ناکەوێت .

دووەم : کۆمەڵێکن چاکەو خراپەیان وەك یەك وایە ، خراپەکانیان ڕێگرن بۆ ئەوەی بچنە بەهەشت ، چاکە کانیان بەرگری لەوە دەکەن بچنە دۆزەخەوە ، ئەوانە پێیان دەوترێت ( أصحاب الأعراف ) واتە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا ڕادەوەستێنرێن تا خوا ویستی لەسەر بێت ، پاش ئەوەی کە ئەهلی بەهەشت دەڕۆنە بەهەشتەوە و دۆزەخییەکان دەخرێنە ئاگرەوە مۆڵەت دەدرێت بە ( أصحاب الأعراف ) یش کە بڕۆنە بەهەشتەوە ، وەك خوای گەورە باسیان دەکات : ﴿وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ٤٦﴾

وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُوا۟ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْأَعْرَافِ رِجَالًا يَعْرِفُونَهُم بِسِيمَٰهُمْ قَالُوا۟ مَآ أَغْنَىٰ عَنكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحْمَةٍ ۚ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٤٩﴾﴾ الأعراف: ٤٦-٤٩ .

واتە : ( لە نێواندا پەردەیەك هەیە کە ڕێگرە لەوەی خۆشی بەهەشتیەکان بگاتە دۆزەخیەکان — وە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخدا قەڵایەکی بەرز هەیە پێی دەوترێت ( أعراف ) کەسانێك هەن بەسەر ئەو قەڵاوە کە چاکەو خراپەیان وەك یەك وایە هەر کەسە و بەدەوم و چاویدا دەناسرێتەوە لە بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان ، ئەعرافەیەکان ڕوو لە بەهەشتی یەکان دەکەن و دەڵێن سڵاوی خواتان لێ بێت لە کاتێکدایە نەڕۆیشتونەتە بەهەشت و تەماعیان هەیە و خۆزگە دەخوازن کە بڕۆنە بەهەشتەوە ، و کاتێك ڕوو لە دۆزەخیەکان دەکەن دەڵێن : خوایە نەمان خەیتە پاڵ تاوانباران و ستەم کاران ، ئەهلی ئەعراف کۆمەڵە پیاوێك بانگ دەکەن کە بەدەم و چاویاندا دەیان ناسنەوە کە دۆزەخین و لە ئەهلی ئاگرن و پێیان دەڵێن : بزانن کە هیچ سوودی پێ نەگەیاندن تاقم و کۆمەڵەکانتان ، نە ئەو خۆ بەزل زانین و خۆ بەگەورە زانینەی بەسەر خەڵکدا دەتان نواند ، ئەوانەی کە ئێستا لەبەهەشتدان لە دونیادا سوێندتان دەخوارد کە خوا هەرگیز چاکەیان لەگەڵدا ناکات ، هەر لەبەر ئەوەی هەژار و نەدار و لاواز بوون خوای گەورە پێیان دەفەرموێت بە ئەهلی ئەعراف بڕۆنە بەهەشتەوە و ئیتر نە لە هیچ دەترسن و نە دڵگرانیش دەبن ) .

سێیەم : کۆمەڵێکن کە یەکتا پەرستن و لە ئەهلی ئیمانن بەڵام بە درێژایی تەمەنیان خراپەو تاوانیان کردووە و تەوبەیان لێ نەکردووە و سووربوون لەسەر گوناهەکانیان و لە قیامەتیشدا ئەوانە دەچنە دۆزەخەوە و هەر کەس بەپێی ڕێژەی گوناهەکانی ،

هەیانە ئاگر دەگاتە لای قولەپێی ، هەیانە دەگاتە نیوەی ئەژنۆی ، هەیانە ئاگر هەموو گیانی دەسوتێنێت تەنها دەم و چاوی نەبێت کە سیمای سوجدە بردنی پێوە دیارە .

ئەم کۆمەڵە خوا مۆڵەت دەدات شەفاعەتیان بۆ بکرێت لەلایەن پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) و پێغەمبەران دوای ئەویش پیاو چاکان و فریشتەکان و هەرکەسێك خوا ڕێزی لێ دەنێت .. بەپێی کارو کردەوەیان دەردەهێنرێن لە دۆزەخدا و دەخرێنە بەهەشتەوە هەتا هیچ کەسێکی تێدا نامێنێت کە لە دونیادا بەیەکتا پەرستی مردبێت ئەگەر هەر خراپەیەکیشی کرد بێت ، بەڵام هەرکەس ئیمانی بەهێزتر بوو بێت و تاوانی کەمتر بوو بێت سزای ئاگری سووك ترە و کەمتر دەمێنێتەوە لە دۆزەخدا و زووتر دەردەهێنرێت و دەخرێتە بەهەشتەوە و بە پێچەوانەشەوە .

لەم بارەشەوە فەرموودە زۆرن لەوانەش پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت : ( من قال لا اله الا الله نفعته یوما من الدهر یصیبه قبل ذلك ما أصابه ) ئیمام طەبەرانی ریوایەتی کردووە .

واتە : ( ئەوەی بڵێ ( لا اله الا الله ) ڕۆژێك سوودی پێ دەگەیەنێت لە قیامەتدا با لەم گەردوونەشدا تووشی هەر شتێك بووبێت ) .

## پ١٩٥: ئایا سزاکان دەبنە کەفارەتی گوناهی خاوەنەکانیان ؟

و: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لەهاوەڵانی لە دەوریدا بوون و فەرمووی ( بایعوني على أن لا تشركوا بالله شيئا ولا تزنوا ولا تقتلوا أولادكم ولا تأتوا ببهتان تفترونه بين ايديكم وأرجكم ولا تعصموا في معروف فمن أوفي منكم فأجره على الله ومن أصاب من ذلك شيئا عوقب به في الدنيا فهو كفارة له و من أصاب من ذلك شيئا ثم ستره الله فهو الى الله ان شاء عفا عنه وان شاء عاقبة ) ئیمام بوخاری و

موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( بەیعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەی کە شەریك بۆ خوا بڕیار نەدەن و دزی نەکەن و زینا نەکەن و منداڵەکانتان نەکوژن و قسە هەڵنەبەستن و بێ گوێی ئەمیرەکانتان نەکەن لە چاکەدا ، هەرکەس خۆی پاراست ئەوە پاداشتی لەلای خەوایە و هەرکەس تووشی یەکێك لەو گوناهانە بوو سزای درا لە دوونیادا ئەوە دەبێتە کەفارەتی ئەو گوناهەو هەرکەس تووشی یەکێك لەو گوناهانە بو خوا بۆی داپۆشی بوو لە دونیادا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا ئەگەر ویستی بوو لێی دەبورێت و ئەگەر بیەوێت سزای دەدات ) بێ گومان ئەمە جگە لە شەریك پەیدا کردن بۆ خوایە .

**پ١٩٦: چۆن ئەم فەرموودەیە ( فهو الی الله أن شاء عفا عنه وأن شاء عاقبه ) یەك دەگرنەوە لەگەڵ ئەوەی لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد کە هەرکەس خراپەکانی زۆر تر بێت لە چاکەکانی دەچێتە دۆزەخەوە ؟**

**و:** هیچ دژایەتیەك و ناڕێکیەك لە نێوان ئەو فەرموودەیە و ئەو بنەمایەدا نی یە چونکە هەر کەس خوا ویستی لەسەر بێت لێ ی خۆش دەبێت و موحاسەبەیەکی ئاسانی دەکات هەر وەك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە ( یدنو احدکم من ربه عزوجل یضع علیه کنفه . فیقول عصلت کذا وکذا فیقول نعم و یقول عملت کذا و کذا فیقول نعم فیقرره ثم یقول إني سترت علیك في الدنیا و أنا اغفرها لك الیوم ، وأما الذین یدخلون النار بذنوبهم فهم معن نیاقش الحساب وقد قال(ﷺ) من نقش الحساب عذب ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : (هەریەکێك لە ئێوە لە پەروەردگاری نزیك دەبێتەوە تا (شانی لەسەر دادەنێ ) خوای گەورە پێی دەڵێت کە فلان کارت کرد دەڵێت بەڵێ خوای گەورە دەفەرموێت ئەو کارەو ئەوکارەت کرد ئەویش دەڵێت بەڵێ و دان دەنێت بە تاوانەکانیدا ، وە خوای گەورە

پێی دەفەرموێت لەدونیادا بۆم پۆشیوی وەئەمڕۆش لێت خۆش دەبم ، ئەوانەی دەچنە دۆزەخەوە بەهۆی تاوانەکانیانەوە ئەوانەن لە موناقەشە و موحاسەبەیان دەکەن ، وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ( هەرکەس موناقەشەو حسابی لەگەڵ بکرێت ئەوا سزا دەدرێت)

## پ١٩٧: ئایا ئەو ڕێگە ڕاستە کامەیە کە خوای گەورە فەرمانی کردووە پابەندین پێوەی و شوێن ڕێبازی تر نەکەوین ؟

و: ئەو ڕێگەیە ئاین و ڕێبازی ئیسلامە کە خوای گەورە بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی و کتێبەکانی بۆ ئەو مەبەستە ناردووەتە خوارەوە ، وە جگە لەو ڕێگەیە شتێکی تر قبوڵ ناکات ، وە هەرکەس ئەو ڕێگەیە نەگرێت ڕزگار نابێت ، وە هەر کەسێ ڕێگەیەکی تر بگرێتە بەر سەری لێ دەشێوێ لە ناو ڕێچکەکاندا ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦ﴾الأنعام: ١٥٣ ، واتە : ( بێگومان ئەوە ڕێبازی ڕاست و ڕاستە قینەی منەشوێنی بکەون ، شوێنی ڕێبازە جۆراو جۆرەکان مەکەون تا لە ڕێبازەکەی خوا وێڵ نەبن ) . هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) هێڵێکی کێشا ، پاشان فەرمووی ( هذا سبیل الله مستقیما ) واتە : ( ئەمە ڕێگاکەی خوایە و ڕاست و ڕێکە ) پاشان چەند هێڵێکی لە لای ڕاست و چەپی یەوە کێشا و فەرمووی ( هذه السبیل منها سبیل الا علیه شیطان یدعو الیه ) واتە : ( ئەمە کوێرە ڕێگاکانن هەر ڕێچکەیەکیان شەیتانێك لەسەری ڕاوەستاوەو خەڵکی بۆ بانگ دەکا ) ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ الأنعام: ١٥٣

.وە ئەمە ڕێبازی منەو راستەو شوێنی بکەونشوێن تولە ڕێگا مەکەون چونکە پەرتەوازەتان دەکات لە ڕێگاکەی ، ئەمە ئەو ئەو ئامۆژگارییەی خوایە بۆتان بۆ ئەوەی لەخواترس بن)

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ( ضرب الله مثلا صراطا مستقيما و على جنبتي الصراط سوران فيهما ابواب مفتحة و على الأبواب ستور مرخاة و على باب الصراط داع يقول : يا ايها الناس أدخلوا الصراط المستقيم جميعا ولا تفرقوا ، وداع يدعو من فوق الصراط فأذا أراد الأنسان أن يفتح شيئا من تلك الأبواب قال ويحك لا تفتحة فأنك إن تفتحه تلجه ، فالصراط الأسلام ، والسوران حدود الله ، و الابوالب المفتحة محارم الله، و ذلك الداعي على رأس الصراط كتاب الله ، والداعي من فوق الصراط واعظ الله في قلب كل مسلم ) ئیمام ئەحمەد و حاكم ریوایەتیان كردووە ، واتە : ( خوای گەورە ئیسلام بە نمونەیەك دەهێنێتەوە كە وەك ڕێگایەكی ڕاست وایە ، لەهەردوو لاوە دوو دیوار و شوورای هەیە ، چەند دەرگایەكی كراوەیان لەسەرە ، لەسەر ئەو دەرگایانەش پەردە دادراوەتەوە لەسەر دەروازەی هەر ڕێگایەش بانگخوازێك هەیەو بانگ دەكات : خەڵكینە بە ڕاستە ڕێگاكەدا بڕۆن و لامەدەن ، لەسەر ڕێگاكەشدا بانگخوازێكی تر هەیە جا ئەگەر هەركەسێك ویستی یەكێ لەو دەرگایانە بكاتەوە ، ئەو بانگخوازە پێ ی دەڵێ ( نەگبەت ) نەیكەیتەوە ، چونكە بیكەیتەوە ( خۆت ناگری ) دەڕۆیتە ژوورەوە . ڕێگا ڕاستەكە ئیسلامە، دوو شوراكەش سنوورەكانی خوایە ، دەرگا كراوەكانیش ئەو كارانەن خوا قەدەغەی كردوون ، ئەو بانگخوازەی لەسەر دەروازەی ڕێگاكە وەستاوە كتێبەكەی خوایە ( واتە قورئان ) ئەو بانگخوازەی سەر ڕێگاكەش بانگخوازانی دینی خوایە لە دڵی هەموو موسڵمانێكدا ) .

## پ١٩٨: مرۆڤ چۆن دەتوانێت خۆ بپارێزێت لە لادان و چەواشە بوون ؟

و: بۆ دەربازبوون لە چەواشە بوون و خۆ دوورگرتن لە ڕێچکە و ڕێبازە دنیاییەکان پێویستە پابەند بین بە قورئان و سوونەتەوەو لەسەر ڕەوث و ڕێبازی ئەوان بڕۆن ، بەوەش یەکتا پەرستی دەچەسپێت و شوێن کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێت ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا﴾ النساء: ٦٩.

واتە : ( ئەوەی گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەر بێت ئەوە لەگەڵ ئەوانەدا دەبێت کە خوا نیعمەت و بەزەیی خۆیی بەسەریاندا ڕژاندووە لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان و ئەوانەش باشترین هاوڕێ و دۆستن ) .. وە هیچ ناز و نیعمەتێك لەوە گەورە تر نی یە کە خوا هیدایەتی مرۆڤ بدات و بیخاتە سەر ڕاستە ڕێی خۆی وە بە دووری بگرێت لە ڕێبازە گومڕاو سەر لێشێواوەکان . وە پێغەمبەر (ﷺ) ئوممەتەکەی لەسەر ئەوە بە جێهێشت وەك دەفەرموێت : (( ترکتکم علی المحجة البیضاء لیلها کنهارها لا یزیغ عنها الا هالك )) ئیمام ئەحمەد و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( بە جێمهێشتن لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا کە شەوەکەی وەك ڕۆژەکەی وایە هیچ کەس خۆی لێ لانادات مەگەر کەسێك تیاچوو سەر لێشێواو بێت).

## پ١٩٩: ئایا چ شتێك پێچەوانەو دژی سوونەتە ؟

و: بیدعەت و[١٦]ی داهێنراو و دروست کراو دژو پێچەوانەی سوونەتە ، ئەویش دانان و بە ئەنجام گەیاندنی کارێکە کە خوا دیاری نەکردوە و مۆڵەتی نەداوە ، وەك

[١٦] بنچینەی وشەی بیدعە لە ( بدع ) ەوە هاتووە واتە شتی زیادکراو دروست کراوو نوێ .

پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت : ( من احدث في امرنا هذا ماليس منه فهو رد ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( هەرکەسێك شتێك دابهێنێ و شتێکی تازە دروست بکات لە ئاییندا و لەم دینەی ئێمەدا نەبێت ئەوە لێ ی وەرناگیرێت و بەرپەرچ دەدرێتەوە ) .

وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( عليكم بستني و سنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي ، تمسكو بها و عضوا عليها بالنواجذ واياكم و محدثات الأمور فان كل محدثة ضلالة )) ئیمام ئەحمەد و ئەبو داود ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( داواتان لێ دەکەم پابەند بن بە ڕێبازی من و ئەو خەلیفە ڕاشیدیانەی پاش من دێن ، توند دەستی پێوە بگرن و بە دانەکانتان توند بیگرن ، داواتان لێ دەکەم کەلە خۆتانەوە شت دامەهێنن لە دییندا چونکە هەموو داهێنراوێك لە دییندا گومڕایی و سەر لێشێواویە ) .

## پ٢٠٠ : بیدعەت دەکرێت بەچەند بەشەوە لە ڕووی زیان گەیاندنی بە دینەوە ؟

و : دەکرێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم : بیدعەیەك کە خاوەنەکەی لە دین دەردەکات .

دووەم : بیدعەیەك کە تاوانەکەی لەوە نزمترە .

## پ٢٠١ : ئەو بیدعانە چین کە خاوەنەکەی لە دین دەردەکات ؟

و : ئەو بیدعانە زۆرن بەڵام چوار چێوەیەکی گشتی هەیە ئەویش ئەوەیە کە ( هەر کەسێك مەسەلەیەك یان بنەمایەکی ئەم دینە بە درۆ بخاتەوە لە کاتێکدا بەڵگەی زانراو و ئاشکرای لەسەر بێت ئەوە لە دیین دەردەچێت چونکە ئەوە بە درۆ خستنەوەی قورئانە و بە درۆ خستنەوەی پێغەمبەرانە ( عليهم الصلاة والسلام ) ،

ئەویش وەك بیدعەی جەهەمییەکان کە سیفەتەکانی خوا هەڵدەوەشێننەوە و قورئان بە دروست کراو دەزانن یان هەریەك لە سیفەتەکانی خوا بە دروست کراو دەزانن ، پاشان بە درۆخستنەوەی ئەوە کە گوایە خوا پێغەمبەر ابراهیمی بە خۆشەویسی خۆی دیاری کردبێت و لەگەڵ پێغەمبەر موسی ( علیه الصلاة والسلام ) قسەی کردبێت . یان وەك بیدعەی قەدەرییەکان کە ئەوانیش بەرپەرچی زانستی خوا دەدەنەوە و بڕوایان بە قەزاو قەدەر نی یە ، یان وەك بیدعەی موجەسەمییەکان کە خوای گەورە دەشوبهێنن بە دروستکراوەکانی خۆی .

ئەمانە هەیان بووە کە نیەتی خۆی لە بنە ڕەتدا بریتی بووە لە ڕووخاندنی بنەماکانی ئاینی ئیسلام و دروست کردنی دوودڵی بۆ موسڵمانان ، ئەمانە گومان نی یە لەدەرچونیان لە دین و بە سەرسەختترین دوژمنی خواو ئیسلام دادەنرێن ، بەلاّم هەیانە ڕێبازەکەیان لێ تێك چووە و بە هەڵە ئەم بیرو ڕایەیان هەیە بەلاّم پاش ئەوەی مەسەلەکەیان بۆ ڕوونکرایەوە و بەڵگەیان لەسەر تۆمار کرا هەر سووربن لەسەر ڕای خۆیان ئەو کات ئەوانیش لە چوار چێوەی ئیسلام دەردەچن و بە موسڵمان دانانرێن.

## پ٢٠٢: ئەو بیدعانە چین خاوەنەکانیان لە دین دەرناکەن ؟

و: بریتیە لەو داهێنراوانەی کە بەناوی دینەوە دەکرێت بەلاّم ناگاتە ئاستی بە درۆخستنەوەی یەکێك لە بنەماکانی ئیسلام یان هەڵوەشاندنەوەی ئەو مەسەلانەی زانراوە و بەڵگەی ئاشکرا و ڕوونی لەسەر هاتووە وەك بیدعەی مەروانییەکان کە لە لایەن (مەروانی کوڕی حەکەم)ەوە سەرپەرشتی دەکران و لەو شتانەش کە دایان هێنابوو قسەکردن بوو بەرامبەر (علی کوڕی ئەبو تالب) ( ڕەزای خوای لێبێت ) لەسەر مینبەر و دواخستنی نوێژ بۆ کاتێکی درەنگ و پێش خستنی خوتبەی پێش نوێژی جەژن ، ئەمانە هەموو هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و تابعینەکان بەر

پەرچیان داونەتەوە و بەڕاستیان نەزانیون بەڵام نەگەشتووەتە ڕادەی بەکافرکردنیان بەڵکو بەردەوامیش بوون لەسەر وەفا کردن بەو بەیعەتەی پێیان داوون و پابەندبوون بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە .

**پ٢٠٣: بیدعە دەکرێت بە چەند جۆرەوە لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە ؟**

**و:** بیدعە دەکرێت بە دوو جۆرەوە :

یەکەم : ئەو بیدعانەی لە خوا پەرستیدا دەکرێت .

دووەم : بیدعە لە مامەڵەدا .

**پ٢٠٤: بیدعەی خوا پەرستی دەکرێت بە چەند جۆرەوە**

**و:** دەکرێت بە دوو بەشەوە :

یەکەم : خوا پەرستی کردن بە جۆرێك کە خوا بەو شێوازە مۆڵەتی لەسەر نەداوە و دیاری نەکردووە کە بەندەکانی بەو شێوەیە بیپەرستن وەك هەندێك کەس و گروپ (ئالەتی مۆسیقا)و (سەما) و (چەپڵە لێدان) و (خۆ کوتان) و( گۆرانی ووتن) بەکار دێنێت بە ناوی خوا پەرستی یەوە خوای گەورەش دەربارەی ئەو جۆرە تاقمانە دەفەرموێت ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ الأنفال:٣٥، واتە : ( ئەوانە نزاو پاڕانەوەکەیان لەلای کەعبەدا جگە لە فیکە لێدان و چەپڵە کوتان شتێکی تر نەبووە ) .

دووەم : خوا پەرستیەك کە خۆی لە بنەڕەتدا دروستە و خوا بەو شێوەیە دیاری کردووە بپەرسترێت بەڵام کەسێك یان گروپێك ئەو کارە لەشوێنی تر بەکاربهێنێت وەك سەر ڕووت کردن لە حەج و عەمرەدا خوا پەرستیەکی دروستە ، بەڵام کەسێك

بیەوێت لە ڕۆژو نوێژیشدا ئەو کارە بکات و بە خوا پەرستی بۆی بنوسرێت ئەوە بیدعەیەکی حەرامە ، یان وەك نوێژی سوننەت لەو کاتانەدا کە ڕێگەی پێ نەدراوە یان ڕۆژ و لە جەژندا .

## پ٢٠٥: چەند حاڵەتی بیدعەمان هەیە لە خوا پەرستیدا ؟

و: دوو حاڵەتمان هەیە :

یەکەم : ئەوەیە کە خوا پەرستیەکە لە بنەڕەتدا بەتاڵ بکاتەوە وەك زیادکردنی ڕکاتێك لەسەر نوێژی بەیانی یان هەر نوێژێکی تر یان کەم کردنی ڕکاتێك لە یەکێك لە نوێژەکاندا بەدەستی ئەنقەست و بێ لە بیر چوون .

دووەم : نەها زیادکراوە کە پوچەڵەو ئەو عیبادەتەی بیدعەکەی ئەنجامدراوە دروستە و شەرعیە وەك زیاد کردنی ڕێژەی دەست نوێژ و زیاد بەکارهێنانی ئاو ، پێغەمبەرمان (ﷺ) نەیفەرمووە دەست نوێژەکە بەتاڵ نادەکاتەوە تەنها ڕێگری لەو کەسانە کردووە کە ئەو جۆرە کارانە دەکەن و بە کارێکی نا پەسەندی داناوە وەك دەفەرموێت : (( فمن زاد علی هذا فقد أساء و تعدی و ظلم )) ئیمام ئەبوداود و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( ئەو کەسەی ئاوی زیاتر بەکاربهێنێت لە دەست نوێژ لەو ڕێژەیەی دیاری کراوە (کە سێ جارە) خراپی کردووە و دەست درێژی نواندووە و ستەمی کرد ) .

## پ٢٠٦: بیدعەی مامەڵە چی یە ؟

و: بریتیە لە دانانی مەرجێك لە مامەڵەکاندا کەنەلە قورئاندا هەبێت و نەلە سوننەتدا هەبێت ،ئەگەر سەد مەرجیش بێت ئەو مەرجانە بەتاڵن و کاریان پێ ناکرێت یان مەرجێك حەلاڵێك حەرام بکات و حەرامێك حەلاڵ بکات وەك پێغەمبەر (ﷺ)

فەرموویەتی : ( فما بال رجال يشترطون شروطا ليست في كتاب الله فأيما شرط ليس في كتاب الله فهو باطل و ان كان مئة شرط ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە . واتە : ( ئەوە چی یە هەندێك لە پیاوەکان چەند مەرجێك دادەنێن لە مامەڵەکانیاندا لە قورئاندا ئەو مەرجانە نین هەرکەس مەرجێك دابنێت و لە قورئاندا نەبێت ئەوە بەتاڵە ئەگەر سەد مەرجیش هەبێت ) .

**پ٢٠٧: چ شتێك لەسەر موسڵمانان پێویستە بیکەن بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و خانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ) ؟**

**و:** ئەوەی لەسەر موسڵمانان پێویستە ئەوەیە کە دڵ و زوبانیان پارێزراو بێت بەرامبەریان ، چاکەکانیان بڵاوبکەنەوە ، هەڵەکانیان نەوروژێنن و ئەوەی لە نێوانیاندا ڕووی داوە بەرادەی پێویست باس بکرێت ، وە ڕێزلێنانیان و بەرز ڕاگرتنیان هەروەك چۆن لە قورئان و ئینجیل و توراتدا باسکراون ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ﴾ الفتح:٢٩ . واتە : ( محمد (ﷺ) نێرراوی خوایە ، ئەوانەش کە لە خزمەتیان و شوێنی کەوتوون ئازا و بەهێزن بە سەر بێ باوەڕاندا ، وەبەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا ، دەیانبینی سەر گەرمی نوێژ و خوا پەرستین ، کڕنوش و سوجدە دەبەن بۆ خوای پەروەردگار ، هەردەم ئاواتیان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی و پایە بەرزی یە ئەویش لە ئەنجامی سوجدە بردن و خوا پەرستیانە ، ئەوە نمونەیانە لە تەوراتدا ، هەروەها نمونەیانە لە ئینجیلیشدا ) .

ئەبێت بڕوامان هەبێت کە خوا سەیری ئەوانەی کردووە کە لە جەنگی بەدردا بەشداریان کردووە و پێی فەرموون چی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم) کە ژمارەیان سێ سەد و سیانزە تا نۆزدە کەس بووە ، وە بڕوامان وایە کە ئەوانەی لە ژێر درەختی ( رضوان ) دا بەیعەتیان دایە پێغەمبەر (ﷺ) کەسیان ناچێتەوە دۆزەخەوە ، چونکە خوا لێیان ڕازی بووە و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون ، کە ژمارەیان هەزارو پێنج سەد یان چوار سەد کەس بووە وەك خوا لە قورئاندافەرموویەتی : ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ﴾ الفتح: ١٨ ، واتە : ( ئەی محمد (ﷺ) بێگومان خوا لەو ئیماندارانە ڕازی بووە کە لە ژێر درەختی ( رضوان )دا بەیعەتیان پێدایت چونکە زانیویەتی بە ڕاستەقینەی و لە دڵەوە بەیعەتیان پێدایت و خواش زانی چی لە دڵیاندایە ) دەبێت شایەتی بدەین کە ئەو چەرخەی ئەوانی تیدا ژیاون چاکترین چەرخی ئەم ئومەتەیە کە ئەمیش چاکترین ئوممەتەکانی سەر ڕووی زەویە ، وە هەر کەسێك وەك کێوی ئوحود ئاڵتون ببەخشێت لە چاکەو فەزڵ دا ناگاتە پلەی ئەوان یان نیوەی ئەوانیش ، لەگەڵ بڕوابونمان بەوەی کە ئەوان بێ تاوان نین و شیاوی ئەوەن هەڵە و کوم و کورتیان هەبێت ، بەڵام موجتەهید بوون هەرکەسێکیان هەڵەی کردبێت یەك چاکەی هەیە و خوا لە هەڵەکەی خۆش دەبێت ، وە ئەگەر ئیجتیهادەکەی ڕاست بێت دوو چاکەی بۆ نووسراوە ، وە ئەوەندە چاکەو فەزڵ و کاری چاکیان هەیە کە هەر خراپە و تاوانێکیشیان هەبێت دەیسڕێتەوە و نایهێڵێت هەر چۆن پیسیەکی کەم کاریگەری ناکاتە سەر ڕووبارێك و پیسی ناکات ئەوانیش بەهەمان شێوە ئەوەندە چاکە و کاری خێریان هەیە هەر خراپە و تاوانێکیشیان کە هەیە دای دەپۆشێت و دەیسڕێتەوە .

بەهەمان شێوە دەبێت هەڵوێستمان وا بێت بەرامبەر بە خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و خانەوادەکەی ، چونکە خوا خانەوادەی پێغەمبەری(ﷺ) پاك کردوونەتەوە لە هەموو پیسی و لەکەیەك ، بەڵام ئەوە بەمانای ئەوە نییە کە ( معصوم ) ن و تاوان ناکەن ، دەبێت هەموو ئیماندارێك خۆشەویستی هەبێت بۆیان و دۆستایەتیان بکات و ڕێزیان بگرێت و بەرگریان لیٚ بکات ، وە بە هەموو شێوەیەك بە دوور بێت لەوەی لە دڵیدا یان لە زبانیدا بە خراپە ناویان بهێنێت یان شتێك بکات لە پلەو ڕێزیان کەم بکاتەوە وە نابێت بە هیچ شێوەیەك قسە بکەین بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەیەکی گشتی وەك فەرموویەتی ( لا تسبوا اصحابي الله الله في اصحابي) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( ئەی خەڵکینە قسە مەڵێن بە هاوەڵانم و لە خوا بترسن سەبارەتیان ) وە هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت ( اني تارك فيكم ثقلين اولهما كتاب الله فخذوا بكتاب الله و تمسكوا به ثم قال : واهل بيتي أذكر كم الله فى اهل بيتى ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( من دوو سەرچاوەی بەهاو ڕێزم بۆ بەجێهێشتوون یەکەمیان قورئانە ، دەست بە قورئانەوە بگرن و پابەند بن پێوەی پاشان خانەوادەی من خواتان لەیاد بێت لە کاتی مامەڵە کردن لەگەڵ خانەوادەی مندا ) .

## پ۲۰۸ : چاکترین هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کێ یە بە شێوەیەکی گشتی ؟

و: چاکترینیان ئەوانەن کەلەسەرەتاوە موسڵمان بوون لە کۆچەرییەکان و پاش ئەوانیش پشتیوانەکان ( الأنصار ) و پاش ئەوانیش ئەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە پاش ئەوانیش ئەوانەی بەشداری ئوحودیان کرد لە دوای ئەوانیش ئەوانەی بەیعەتیان دا لە ژێر درەختی ( رضوان )دا و لە پاش ئەوانیش ئەوانەی دوان

هاتووە ﴿مَنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَـٰتَلَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَـٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ الحديد: ۱۰ . واتە : ( ئەوانەی سەروەت و سامانیان بەخشیوە لە پێناو خوادا لە پێش ڕزگارکردنی مەککە و جیهادیان کردووە لە پێناو خوادا پلەیان بەرز و چاکترە لەوانەی سەروەت و سامانیان بەخشیوە لە پاش ڕزگارکردنی مەککە و هەر یەکەشیان پاداشتی خۆی هەیە هەر چەندە لە پلەدا جیاواز بن ) .

## پ۲۰۹ : چاکترین هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کێ یە بە شێوەیەکی تایبەت ؟

و: عەبدوڵلای کوڕی عومەر ( ڕەزای خوا لە هەردوکیان بێت ) دەڵێت : ئێمە نە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پلەو پایەی هیچ کەسمان نە ئەگەیاندە ئاستی ئەبوبەکر پاش ئەویش عومەر پاش ئەویش عوسمان بەڵام دوای ئەزان هاوەڵانی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەیەك ئاستدا دەبینینەوە وە هیچ کەسێکمان بە چاکتر نەدەزانی لەوی تر ) ئیمام بوخاری ئەبو داود گێڕاویانەتەوە .

وە پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە ئەبوبەکر دەفەرموێت : ( ان الله بعثني اليكم فقلتم كذبت و قال ابوبكر صدقت وواساني بنفسه وماله فهل انتم تاركوا لي اصحابى ) خوای گەورە منی نارد بۆ ئێوە ، وتتان درۆدەکەیت و ئەبوبەکر ووتی ڕاست دەکەیت وە دڵنەوایی کردم و پشتگیری لێکردم بە ماڵ و بەگیانی خۆی ئایا ئێوە واز لە هاوڕێکانم دێنن بۆ مَنْ ) .

سەبارەت بە عومەری کوڕی خەتاب دەفەرموێت ( إيهايا ابن الخطاب والذى نفسى بيده ما لقيك الشيطان سالكا فجا قط الا سلك فجا غير فجك ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( زیادی بکە لە قسەو گوفتارت ئەی عومەری

کوڕی خەتتاب بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە تۆ لە ڕۆشتنندا شیوێك بگریتە بەر شەیتان لە ترسی تۆ بە شیوێکی تردا دەڕوات ) .

وەسەبارەت بە عوسمانی کوڕی عەففان دەفەرموێت : ( من جهز جيش العسرة فله الجنة ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( ئەوەی سوپای تەبوك كە بە سوپای ( العسرة ) ناسراوە بۆمان ئامادە بکات بەهەشت جێگەیەتی ) عوسمانی کوڕی عەففان ئەو سوپایەی ئامادە کرد لە ڕووی چەك و پێداویستیەکانی جەنگەوە .

سەبارەت بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەفەرموێت : ( انت مني وانا منك ) ئیمامی بوخاری و ترمزی ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( ئەی عەلی تۆ لە منیت و منیش لە تۆم ) ، وەلە فەرموودەیەکدا سەبارەت بەهەندێك لە هاوەڵانی خۆی دەفەرموێت ( ارحم امتي بامتي ابوبكر واشدها في دين الله عمر ، و اصدقها حياء عثمان ، و اعلمها بالحلال و الحرام معاذ بن الجبل ، واقرؤها الكتاب الله عزوجل ابي ابن كعب ، و اعلمها بالفرائض زيد بن ثابت ولكل امة امين و امين هذه الامة ابو عبيدة بن الجراح ) ئیمام ئەحمەد و ترمزی ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( بەسۆزترین کەس بە ئومەتەکەم ئەبوبەکرە ، و توندترینیان بۆ دینی خوا عومەرە ، ڕاست گۆترینیان لە شەرم نواندندا عوسمانە ، زاناترینیان بە حەڵاڵ و حەرام موعازی کوڕی جەبەلە ، وە چاکترینیان لە خوێندنەوەی قورئاندا ئوبەی کوڕی کەعبە ، شارەزاترینیان لە زانستی فەرائیزدا زەیدی کوڕی سابتە ، وە لە هەموو ئومەتێکدا دەست پاکێك هەیە ، دەست پاکی ئەم ئومەتەش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراحە ) .

وە سەبارەت بە حەسەن و حسێنی کوڕی علی دەفەرموێت : ( انهما سيدا شباب اهل الجنة ) ئیمام ترمزی ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( حەسەن و حسێن لە بەرێزترین لاوەکانی بەهەشتن ) .

وە سەبارەت بە فاتیمەی کچی دەفەرموێت : ( انها سيدة نساء الجنة ) ئیمام بوخاری و ترمزی ڕیوایەتیان کردووە ، واتە ( فاتیمە سەروەری ئافرەتانی بەهەشتن) وە بۆ هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بە شێوەیەکی گشتی بێت یان تاک تاک بێت چاکە و فەزڵ و ڕێزیان دیاری کراوە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ، بەڵام ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە کارێکدا زۆر چاك بووە ئەوە مانای وا بێت ئەوەیان لە هەموو هاوەڵانی تر چاکترە لە هەموو ڕوویەکەوە ، جگە لە چوار خەلیفەکە کە هەموو ئەهلی سوننەت و جەماعەت یەك دەنگ بوون لەسەر ئەوەی چاکترین و باشترین هاوەڵانی پێغەمبەر بوون (ﷺ) لە هەموو لایەکەوە .

## پ٢١٠: پاش پێغەمبەر (ﷺ) ماوەی خەلیفایەتی چەندە ؟

و: پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودەیەکدا ئاماژەی پێ کردووەو دەفەرمووێت : ( خلافة النبوة ثلاثون سنة ، يؤتي الله الملك من يشاء ) ئیمام ترمزی و ئەبوداود و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( خەلیفایەتی پێغەمبەر (ﷺ) (٣٠) ساڵ بەردەوام دەبێت پاشان خوا دەسەڵات دەبەخشێتە ئەو کەسەی دەیەوێ ) ئەبوبەکر دوو ساڵ و سێ مانگ خەلیفایەتی کردووە ، عومەری کوڕی خەتاب دە ساڵ و شەش مانگ ، عوسمانی کوڕی عەففان دوانزە ساڵ ، عەلی کوڕی ئەبو تالیب چوار ساڵ و نۆ مانگ ، وە حەسەنی کوڕی علی شەش مانگ ، بەم شێوەیە (٣٠) ساڵ پڕ دەبێتەوە وە یەکەم پاشا لە ئیسلامدا موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانە ئەویش چاکترینیان و بەڕێز ترینیانە ، پاش ئەویش چەند پادشایەك هاتن کە دەسەڵاتی ئیسلامییان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لاواز و کەم و کورت دەنواند ، هەتا عومەری کوڕی عبد العزيز هات کە ئەهلی سوونەت بە پێنجەمین خەلیفەی ڕاشیدینی دەزانن بە هۆی ئەوەی کەلەسەر ڕێبازی ئەوان دەڕۆشت .

**پ٢١١: بەلگەی خەلیفایەتی هەر چوار خەلیفەکە بە کورتی چی یە ؟**

و: بەلگەی زۆرن لەوانەش پلەی ڕێزو حورمەتیان بە سەر خەلکی تردا و هەروەها ڕیزبەندیان لە چاکی و خزمەت کردنیان بە ئیسلام و سنووردارکردنی ماوەی خەلیفایەتی بە (٣٠) سالٚ کە کۆی خەلیفایەتی هەر چواریان نزیکەی سی سالٚ دەبێتەوە وەك لە فەرمودەکەدا ئاماژەی پێ کراوە و لە هەموویان گرنگ تر ئیجماعی موسلمانانە لەسەر شیاویی و دروستی ئەو چوار خەلیفەیە و ڕێزیان بەسەر خەلکی ترەوە ، ئەمە ڕاستیەکی حاشا هەلنەگرە و هیچ کەس ناتوانێت بەرپەرچی بداتەوە مەگەر کەسێکی سەرلێشێواو و گومڕا نەبێت .

**پ٢١٢: بەلگەی خەلیفایەتی ئەو سێ هاوەلەی پێغەمبەر (ﷺ) چی یە بە شێوەیەکی کورت ؟**

و: بەلگە لەسەر ئەوە زۆرە ، وەك لەوەوپێش ئاماژەمان بە هەندێکی کرد لەوانەش ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو بەکر ( ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت ) دەیگێڕێتەوە ( ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێ خەوی بینیوە ، بۆمان بگێڕێتەوە ؟ پیاوێك ووتی من ، لە خەونمدا بینیم تەرازوویەك لە ئاسماندا هینرایە خوارەوە تۆ و ئەبوبەکر خرانە تەرازووەکە وە ئەبوبەکر و عومەر خرانە تەرازووەکە وە ئەبوبەکر قورستر دەرچوو و پاشان عومەر و عوسمان خرانە تەرازووەکەوە عومەر قورستر دەرچوو و پاشان تەرازووەکە بەرز کرایەوە ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

**پ٢١٣: بەلگەی خەلیفایەتی ئەبوبەکر و عومەر بە شێوەیەکی کورت چی یە ؟**

و: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( لە خەونمدا بینیم کە لەسەر بیرە ئاوێك وەستاوم و بە دۆڵچە ئاوم لێ دەردەهێنا تا خوا ویستی لەسەر بوو پاشان ئەبوبەکر لێ ی وەرگرتم ئەویش دەستی کردە ئاو دەرهێنان دۆڵچەیەك یان دوو دۆڵچەی لێ دەرهێناو لە دەرهێنانەکەیدا لاوازیەك بەدی دەکرا خوا لەو لاوازییەی ببورێت پاشان عومەری کوڕی خەتاب دۆڵچەیەکی گەورەی گرتە دەست و دەستی کرد بە ئاو دەرهێنان هیچ پیاوێکی ئازای وام نەبینیوە وەك عومەر ئاو دەربهێنێت هەتا تێر ئاو بوون و گیان لەبەرەکانیشیان ئاودار و تێر ئاو بوون ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە .

## پ٢١٤: بەڵگە چی یە لەسەر شایستەی ئەبوبەکر بۆ خەلیفایەتی و دانانی بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ) ؟

و: بەڵگە لەسە رئەوە زۆرە ، هەندێکی لە پێشەوە ئاماژەی پێکراوە وەك نمونەش ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ی خوا (ﷺ) و پاش تەواو بوونی کارەکەی داوای لێ کرد کە ماوەیەکی تر سەردانی بکاتەوە ، ئافرەتەکە ووتی ئەگەر هاتمەوە و تۆم دەست نەکەوت ، مەبەست پێی مردنی بوو ، فەرمووی : (( ان لم تجدني فأت ابابكر )) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : (( ئەگەر منت دەست نەکەوت وەرە بۆ لای ئەبوبەکر )) .

وە هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە عائیشە دەیگێرێتەوە و دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێم : ( ادعي لي اباك و اخاك حتى اكتب كتابا فإني اخاف ان يتمنى و يقول قائل انا اولى و يأبى الله و المؤمنون الا ابا بكر ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( باوکت و براکەتم بۆ بانگ بکە تا نووسراوێك بنوسم چونکە دەترسم ئاواتە خوازێك ئاوات بخوازێتە شوێنەکەی من یان کەسێك بڵێت من شایستەی ئەو

شوێنەم بەڵام خواو موسڵمانان تەنها ئەبو بەکر بە شایستەی ئەو شوێنە دەزانن ) ، وە هەروەها کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کە نە خۆش بوو پێش کۆچی دوایی داوای کرد لە ئەبو بەکر ئیمامەتی نوێژیان بۆ بکات و جگە لەوەش هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتیان دایە لە کاتێکدا بو بە خەلیفە ، وە کۆچەریەکان و پشتیوانەکان کۆن لەسەر شایستەیی ئەبوبەکر بۆ جێنشینی پێغەمبەریش (ﷺ) .

## پ٢١٥: بەڵگە چی یە لەسەر شایستەی عومەری کوڕی خەتاب بۆ خەلیفایەتی پاش ئەبوبەکر ؟

و: بەڵگە لەسەر ئەوە زۆرە وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێ کردووە لەوانەش پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی ( اني لاادري ماقدر بقائي فيكم فأقتدوا بالذين من بعدي ) ئیمام ترمزی و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( من نازانم تا چەند دەمێنمەوە لە نێوانتاندا پەیوەست بن بەو دوانەی لەپاش منەوە دێن ) وە بە دەست ئیشارەتی کرد بۆ ئەبوبەکر و عومەر و هەروەها لەو فەرموودەیەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) باس لە دەرکەوتنی فیتنەیەك دەکات کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدات ،کە حوزەیفە بۆمان دەگێڕێتەوە و تێیدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە عومەر دەڵێت : ( ان بينك و بينها بابا مغلقا ، قال ايفتح ام يكسر قال : بل يكسر قال عمر اذا لا يغلق ، فكان الباب عمر و كسر قتله ، فلم يرفع سيفه بين الامة ) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( ئەی عومەر لەنێوان تۆ و ئەو فیتنەیەدا دەرگایەکی داخراو هەیە ، عومەر ووتی ئەکرێتەوە یان دەشکێنرێت ، فەرمووی : دەشکێنرێت ، عومەر ووتی : کەواتە پاش شکاندنەکەی داناخرێتەوە ، دەرگاکە عومەر بوو شکاندنەکەش شەهید کردنی بوو ، وە لە پاش ئەوەوەشمشێرەکان لانەبراون لە نێو ئوممەتی موحەمەدەوە (ﷺ) ) کە ئەوەش ئیشارەتە بۆ بەردەوام

بوونی ناکۆکی لە نێوان موسڵمانانـدا ، وە هەموو ئەهلی سوننەت کۆن لەسەر شایستەیی عومەر بۆ خەلیفایەتی پاش ئەبوبەکر ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێت .

## پ٢١٦: بەلگە چی یە لەسەر شایستەیی عوسمانی کوڕی عەففان بۆ خەلیفایەتی پاش ئەبوبەکر و عومەر ؟

و: بەلگە لەسەر ئەوە زۆرە ، وەك هەندێکیان لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد و لەوانەش ئەو فەرمودەیەی کە کەعبی کوڕی عەجرە دەیگێڕێتەوە و دەڵێت : ( ذکر رسول الله (ﷺ) فتنة فقر بها فمر رجل مقنع راسه فقال رسول الله (ﷺ) هذا یومئذ علی الهدی فوثبت فأخذت بضبعي عثمان ثم استقبلت رسول الله (ﷺ) فقلت هذا قال هذا ) ئیمام ترمزی و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە .

واتە : ( پێغەمبەر (ﷺ) باسی لە فیتنەو گێژاوێك دەکرد دانی پێدا نا کە شتێکی وا ڕوودەدات لەو کاتەدا پیاوێکی سەر داپۆشراو تێپەڕی ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەو پیاوە لەو ڕۆژەدا لەسەر هیدایەت و ڕاستیە ، منیش هەڵمەتم برد و قۆڵیم گرت کە دیم عوسمانی کوڕی عەففانە و ڕوویم کردە پێغەمبەری خوا ووتم ئەمە ووتی ئەمە) .

وە هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت : ( یا عثمان ان ولاك الله هذا الأمر یوما فارادك المنافقون ان تخلع قمیصك الذی قمصك الله فلا تخلعه) ئیمام ترمزی ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( ئەی عوسمان ئەگەر ڕۆژێك خوا کردیتی بە گەورەی موسڵمانان و دووڕووەکان وویستیان ئەو کراسەی کە خوا لەبەرتی کردووە دایبکەنیت داینەکەنیت ) ئەمەی سێ جار دووبارە کردوەتەوە هەموو ئەهلی شووراو پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر کۆبوون لەسەر بەیعەت پێدانی و یەکەم کەسیش بەیعەتی

دایە عوسمان پاش عەبدورەحمانی کوڕی عەوف ، عەلی کوڕی ئەبو تالب بوو پاشان خەڵکەکە بەگشتی بەیعەتی دا .

## پ٢١٧: بەڵگەی شایستەیی علی کوڕی ئەبو تالیب چی یە لەسەر خەلیفایەتی پاش عوسمانی کوڕی عەففان؟

و: بەڵگە لەسەر ئەوە زۆرە ، پێغەمبەریش دەفەرموێت : ( ويح عمار تقتله الفئة الباغية يدعوهم الى الجنة و يدعونه الى النار ) ئیمام بوخاری و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( داخەکەم بۆ عەمار ، کۆمەڵێکی یاخی بوو دەیکوژن ( عەمار ) بانگیان دەکات بۆ بەهەشت و کەچی ئەوان بانگی دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ ) .

عەماریش لەگەڵ علی دا بوو کە خەڵکی شامی بانگ دەکرد بۆ لای ئەهلی سوننەت و جەماعەت و گوێڕایەڵی کردنی ئەمیری موسڵمانان علی کوڕی ئەبو تالیب بەڵام ئەوان لە ڕیزی دەرچووەکان بوون و عەماریشیان شەهید کرد .

وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە شایستەیی علی لەسەر حەق بوونی دەفەرموێت ( تمرق مارقة على حين فرقة من الناس يقتلهم أولى الطائفتين بالحق ) ئیمام موسلیم ڕیوایەی کردووە ، واتە : ( یاخی ئەبن دەستەیەکی یاخی بوو لە کاتی دووبەرەکی و کێشەدا یەکێك لەو دوو کۆمەڵەی کە ناکۆکن لە نێوان خۆیانداو لە هەق نزیکترە ئەو دەستە یاخی بووە دەکوژن ) خەواریجەکان پاش ئەوەی ئیمامی عەلی بەڵگەی لەسەر تۆمارکردن و ڕاستی بۆ ڕوون کردنەوە بەڵام لەسەر قسەی خۆیان هەر سوور بوون ، دەستی کرد بە کوشتنیان و لە جەنگی نەهرەواندا لە ناوی بردن و بە پێی ڕای هەموو ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئیمامی علی بە شایستەترین کەس دادەنرێت بۆ خەلیفایەتی پاش عوسمانی کوڕی عەففان .

**پ٢١٨: واجبی سەرشانی موسڵمانان بەرامبەر بە ئەمیرەکانیان چی یە ؟**

و: واجبە لەسەر تاکەکانی موسڵمان ئامۆژگری ئەمیرەکانیان بکەن لەسەر حەق و ڕاستی ، گوێڕایەڵیان بن ، نوێژیان لەپشتەوە بکەن جیهادیان لەگەڵدا بکەن ، زەکات و صەدەقاتیان بۆ ببەن ، ئارامیان لەسەر بگرن ئەگەر ستەمیان کرد ، مەغروریان نەکەن بە پیاهەڵدان و درۆکردن بۆیان ، وە دوعای چاکیان بۆ بکرێت و دەرنەچوون لەسایەی ئەو ئەمیرەدا ئەگەر پاڵنەرێکی شەرعی نەبێت .

**پ٢١٩: بەڵگەی ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد چی یە ؟**

و: بەڵگە لەسەر ئەو مەسەلەیە زۆرە لەوانەش خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾ النساء: ٥٩ ، واتە : (ئەی ئەوانەی ئیماندارن گوێ ڕایەڵی خوا بکەن (کەبریتی یە بە پابەند بوون بە قورئانەکەیەوە وە گوێڕایەڵی ئەو سەرۆکانە بکەن کە لە خۆتانن لە کاتێکدا فەرمانتان پێ دەکەن بە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر) .

و پێغەمبەریشمان (ﷺ) فەرموویەتی : ( اسمعوا واطيعوا وان تأمر عليكم عبد ) ئیمام بوخاری ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( ببیستن و گوێڕایەڵ بن ئەگەر بەندەیەکیش کرا بە ئەمیر بەسەرتانەوە ) ، وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ( وان ضرب ظهرك واخذ مالك فاسمع واطع ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، کە فەرموودەیەکی درێژە و داوا دەکات کە موسڵمانان گوێڕایەڵی گەورە و ئەمیرەکانیان بن بەمەرجێك لەسەر شەریعەت و دادگەری کاربکەن ئەگەر لەپشتیان بدرێت و دەست بەسەر ماڵیاندا بگیرێت ئەبێت ببیستن و گوێڕایەڵ بن ) .

وه هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت : ( ان امر علیکم عبد مجدوع اسود یقودکم بکتاب الله فاسمعوا له و اطیعوا ) ئیمام موسلیم و ئیبن ماجه ڕیوایەتیان کردووە ، واتە : ( ئەگەر بەندەیەکی ڕەش پێست و لوت بڕاویان کردە ئەمیرتان و لەسەر بەرنامەی قورئان کاری دەکرد گوێ بیست بن و گوێڕایەڵی بکەن ) .

## پ٢٢٠: فەرماندان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە بەرامبەر کێ واجبە و چەند پلەی هەیە ؟

و: خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ آل عمران: ١٠٤ . واتە : ( با لەنێو ئێوە کۆمەڵێك هەبێت خەڵکی بانگ بکەن بۆ ئیسلام و چاکە و چاکە خوازبن و فەرمان بدەن بە چاکە و ڕێگری بکەن لە خراپە ، هەرچەندە لەسەر تاك تاکی موسڵمان فەرزە ، ئەو کەسانەی بەم کارانە هەڵدەستن سەرفراز و سەرکەوتوون ) وە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت : ( من رای منکم منکرا فلیغیره بیده فان لم یستطع فبلسانه ، فان لم یستطع فبقلبه و ذلك اضعف الأیمان ) ئیمام موسلیم ڕیوایەتی کردووە ، واتە : ( هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەر خراپە و تاوانێکی بینی با بە دەست بیگۆڕێت ، ئەگەر بۆی نەکرا با بەزمان بیگۆڕێ ، ئەوا با بە دڵ پێی ناخۆش بێت ، کە ئەوەش نزمترین پلەی ئیمانداریە).

وە لەم ڕووەوە لە قورئاندا چەندین ئایەت هاتووە ، وە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) چەندین دەق هاتووە کە فەرز بوون و پێویست بوونی ئەم ئەرکە دوپات دەکەنەوە ، هەرکەس خراپەیەکی دی لەسەری واجبە لای بدات و ئەو واجبەی لەسەر

لاناچێت تا کەسێکی تر ئەو خراپەیە لابدات و هەرکەس بە پێی توانای خۆی ، وە هەرکەسێك بە دەسەڵات تر و زاناتر بێت ئەم ئەرکەی زیاتر لەسەر واجب دەبێت ، وە لە کاتی دابەزینی سزای خوایی بۆ سەر نەتەوەکان کەس ڕزگاری نابێت وە ئەگەر ئەو کەسانە نەبێت کە ڕێگەیان لە خراپە گرتووە.

**پ٢٢١: حوکمی کەرامەتی[١٧] وەلی یەکان (دۆستەکان)ی خوا چی یە؟**

**و:** بوونی کەرامەتی دۆستەکانی خوا ڕاستە ، کە بریتی یە لە دەرکەوتنی هەندێك دیاردە کە لە دەسەڵات و توانای مرۆڤدا نی یە ، بەڵکو لەسەر دەستی ئەوان ئەو ڕووداوە دەخولقێنێ ، با خۆشیان پێی نەزانن وەك چیرۆکی کۆمەڵە لاوی ئەشکەوتەکە ، یان ئەو سێ هاوڕێ یەی لە ئەشکەوتەکەدا بوون و تاشە بەردەکە دەرگاکەی لێ گرتن ، یان چیرۆکی جورەیج، کە ئەم دیاردانەش پاڵپشت بوون بۆ موعجیزەی پێغەمبەرەکانیان ، لەبەرئەوە لە ئوممەتی موحەممەدا کەرامات زۆرترن و گەورەترن لەبەر گەورەیی و بەرزیی پێغەمبەرمان (ﷺ) ، وەك بانگکردنی عومەری کوڕی خەتتاب بۆ ساریە لە کاتێکدا لە جیهاددا بوو لە بانگکردنەکەی بیست ، وە یان ئەسپەکەی عەلائی کوڕی حەزرەمی کە بەسەر ڕووبارەکەدا ڕۆشت لە کاتێکدا دژی ڕۆمەکان غەزای دەکرد ، یان نوێژکردنی ئەبو موسلیمی خەوەلانی لە ئاگرەکەدا کە ئەسوەدی کوڕی عەنسی بۆی ساز کردبوو ، بۆ ئەوەی بیسوتێنێت ، لە نمونەی ئەو کەراماتانە زۆرن کە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوویداوە و لە پاش، ئەویش

---

[١٧] کەرامەت : بریتیە لە ڕێزلێنانی خوا بۆ دۆستەکانی خۆی یەکەم بە ئیستیقامەت بوون لەسەر خواناسی و لە خوا ترسی و سووربوون لەسەر پیادەکردنی شەریعەت لە کردار و گوفتاردا لە پەنهان و ئاشکرادا پاشان پەیدابوونی هەندێك شت لەسەر دەستی ئەو دۆستانەی خوا کە لە دەسەڵات و توانای مرۆڤ دا نییە ئەو شتانەش سەر ئاسان (خرق العادة)ی ژیانی سروشتی مرۆڤن بەڵام خوا کردوویەتی بە دیاری بۆ ئەو دۆستانە و بەڵگە بەسەر خەڵکەوە.

لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکاندا و لەسەردەمی تابیعیەکاندا ، لە پاش ئەوانیش تا ڕۆژی قیامەتیش بەردەوام دەبێت ، وە لە ڕاستیشدا ئەمانە هەمووی ڕاستیی و موعجیزەی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنن، چونکە ئەو کەسانە بە هۆی پابەند بوونیان بە ڕێبازەکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەو دیاردانە دەردەکەوێت لەسەر دەستیان ، وە ئەگەر شتێك لە کەسێکەوە دەرکەوت کە لە سروشتی ژیانی مرۆڤێکی ئاسایدا نەبێت و پابەند نەبێت بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ئەوە جادوگەری و سیحر و فرت و فێڵە و کەرامەت نی یە ، وە ئەوانەش لە لایەن جنۆکە و شەیتانەکانەوە پشتگیری دەکرێن.

### پ٢٢٢: وەلی[18] خوا کێ یە؟

و: وەلی خوا ئەو کەسەیە کە بڕوای بەخوا هێنابێت و لەخوا بترسێت و شوێن سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت ، خوای بەهێز و بە توانا وەسفی وەلی خۆی دەکات لە قورئاندا بەم شێوەیە ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾(یونس: ٦٢) ، واتە (ئاگادارین بێگومان دۆستانی خوا ترسیان لەسەر نییە و خەفەتیش ناخۆن وە ئەوانە یاوەریان هێناوە وە هەمیشە خۆیان دەپارێزن لەخواترسن).

﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾﴾ (المائده: ٥٥-٥٦) ، واتە (دۆست و پشتگیری ئێوە ئەی ئیمانداران ، خواو پێغەمبەری خوا و ئیماندارانن ، ئەوانەی نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن ، کڕنوش بۆ خوا دەبەن ، وە ئەوەی

[18] وەلی: ئەو کەسەیە کە دوو سیفەتی تێدا کۆ دەبێتەوە (ئیمان)کە حاڵەتی ناسین و زانین و ملکەچی و قبوڵ کردنی دەروونیە (تقوی) کە پابەندی و گەردنکەچی ناوەرۆك و ڕواڵەت دەگەیەنێت.

پشتگیری و دۆستایەتی خوا و پێغەمبەری خواو موسڵمانان بکات ئەوە لە کۆمەڵی خوایە و کۆمەڵی خواش بێگومان سەرکەوتوو سەرفرازە لە دنیا و قیامەتدا).

پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی (ان ال ابي فلان ليسوا لي بأولياء انما أوليائي المتقون) ئیمام بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

واتە (فلانە تیرە دۆست و پشتیوانی من نین ؛ دۆست پشتیوانەکانی من لەخوا ترسەکانن) ، حەسەنی بەصریش خوای لێ ڕازی بێت ووتوویەتی (کۆمەڵێك بانگەشەی خۆشەویستی خوایان کرد ، خواش تاقی کردنەوە بەم ئایەتە﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾ ﴾ (ال عمران: ٣١) ، واتە (بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێن بەرنامەکەی من بکەون ئەو کاتە خواش ئێوەی خۆش دەوێت)).

وە ئیمامی شافعیش ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت (اذا رأيتم الرجل يمشي على الماء و يطير في الهواء فلا تصدقوه و لاتغتروا به حتى تعلموا متابعته للرسول(ﷺ)) واتە ( ئەگەر کەسێکتان بینی لەسەر ئاو دەڕۆشت یان لە هەوادا دەفڕی بڕوای پێ مەکەن و پێی هەڵمەخڵەتێن تا ڕادەی پابەند بوونی بە سوننەتی پێغەمبەرەوە دەزانن).

**پ٢٢٣: ئەو تاقمە کێن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا باسی کردوون ( لا تزال طائفة من أمتي على الحق ظاهرة لا يضرهم من خالفهم حتى يأتي امر الله تبارك و تعالى ) ئیمام بوخاری و موسلیم و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە.**

**واتە: (بە بەردەوامیی تاقمێك هەن لە ئوممەتەکەم کە لەسەر هەقن وە بە هۆی بەرگری کردنیان لەو حەقە سەرکەوتوو دەبن زیانیان پێ ناگەیەنێت، قسە و کرداری ئەوانەی بیر و ڕایان پێچەوانەی ئەوانەیە تا فەرمانی خوای گەورە خۆی دێت بە کۆتایی هاتنی ژیانی دونیا ).**

و: ئەو تاقمە بریتین لە تاقمی ڕزگار بوو لە کۆی ئەو حەفتاوسێ تاقمەی کە پێغەمبەر جیای کردونەتەوە و لە فەرمودەکەیدا باسی کردووە، (كلها في النار إلا واحدة و هي الجماعة) ئیمام ئیبن و ماجە ڕیوایەتی کردووە، واتە (ئەو حەفتا و سێ تاقمە هەموویان دەچنە دۆزەخ تەنها یەکێکیان نەبێت کە ئەویش کۆمەڵی موسڵمانانە) یان لە ڕیوایەتێکی تردا (هم من كان على مثل أنا عليه اليوم و أصحابي) ئیمام ترمزی ڕیوایەتی کردووە، واتە (جەماعەت ئەوانەن کە پاش من دێن بەڵام لەسەر هەمان ڕەوت و ڕێباز دەڕۆن کە من و یارەکانم پیادەی دەکەین).

دەخوازین لە خوای گەورە کە بمانگێڕێت بە یەکێك لە ئەهلی جەماعەت و لەو تاقمە ڕزگار بووە، دڵەکانمان گومڕا نەکات دوای ئەوەی کە خوا ڕێنمایی کردوین و هیوا خوازین کە خوا بەزەیی برژێنێت بەسەرماندا چونکە خۆی بەخشندە و میهرەبان و بە بەزەییە.

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون**

## پێرستی بابەتەکان

پ١٨ : مانای شایەتیدان بە ( اشهد أن لا اله الا الله ) چی یە ؟

پ١٩ : مەرجەکانی شایەتی دان ( اشهد أن لا الـه الا الله ) چـی یـە و ئـەو مەرجانـەی پێویستە لە دەربڕینی ئەو شایەتییەدا هەبێت چین ؟

پ٢٠ بەڵگە چیە لەسەر بەمەرج گرتنی ( زانین ) بوون لە چەسپاندنی مانـای یـەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٢١ : بەڵگە چیە لەسەر بە مەرج گرتنـی ( یـەقین ) لـە چەسپاندنی یەکتا پەرستی خوادا لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٢٢ : بەڵگە چیە لەسەر بە مـەرج گرتنـی ( ملکـەچ بـوون ) بـۆ چەسـپاندنی یـەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٢٣ : بەڵگە چـی یـە لـسەر بـە مـەرج گرتنـی ( ڕازی بـوون )بـۆ چەسـپاندنی یـەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٢٤ : بەڵگە چی یە لەسەر بە مەرج گرتنی دڵسۆزی بـۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٢٥ : بەڵگەی مەرج گرتنی ڕاستگۆیی بۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی لـە قورئـان و سوننەتدا چیە ؟

پ٢٦ : بەڵگەی بە مەرج گرتنی خۆشەویستی بۆ چەسپاندنی یەکتا پەرستی خـوا لـە قورئان و سوننەتدا چی یە ؟

پ٢٧ : بەڵگە چی یە لەسەر دۆستایەتی و دوژمنایەتی لە پێناو خوادا ؟

پ٢٨ : بەڵگەی شایەتیدان بەوەی کە محمد ﷺ نێردراوی خوایە چی یە ؟

پ٢٩ : مانای شایەتیدان بەوەی کە محمد نێردراوی خوایە چی یە ؟

پ٣١ : بەڵگەی فەرز بوونی نوێژ و زەکات چی یە ؟

پ٣٢ : بەڵگەی فەرز بوونی ڕۆژوو چی یە ؟

پ٣٣: بەڵگەی فەرز بوونی حەج چی یە ؟

پ٣٤: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە ئینکاری فەرزبوونی یەکێك لە پایەکانی ئیسلام بکات یان دان بنێت بە فەرز بوونیدا بەڵام خۆی بە گەورە بگرێت و جێ بەجێ ی نەکات ؟

پ٣٥: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە بڕوای هەبێت بە فەرزەکان بەڵام واز لە یەکێکیان بهێنێت بەهۆی تەمەڵی یان تەئویل کردن ؟

پ٣٦: ئیمان چی یە ؟

پ٣٧: بەڵگە چی یە کە ئیمان کردار و گوفتارە ؟

پ٣٨: بەڵگە چی یە لەسەر زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان ؟

پ٣٩: بەڵگە چی یە لەسەر پلە جیاوازی ئەهلی ئیمان ؟

پ٤٢: بە کورتی بەڵگەی شەش پایەی ئیمان چی یە لە قورئاندا ؟

پ٤٣: مانای بڕواهێنان بەخوا چی یە ؟

پ٤٤: یەکتا پەرستی خوایەتی ( ألوهیة ) چی یە ؟

پ٤٥: چ شتێك دژی یەکخواناسی خوایەتی یە ؟

پ٤٦: شیرکی گەورە چی یە ؟

پ٤٧: شیرکی بچوك چی یە ؟

پ٤٨: جیاوازی چی یە لە نێوان ( واو ) و ( ثم – پاشان ) بۆ ئەو قسانەی سەرەوە ؟

پ٤٩: یەکتا پەرستی پەروەردگاریەتی ( الربوبیة ) چی یە ؟

پ٥٠: چ شتێك دژی یەکتا پەرستی پەروەردگاریەتی یە ؟

پ٥١: ئایا یەکتا پەرستی ناو و سیفەتەکانی چی یە ؟

پ٥٢: بەڵگەی بوونی ناوەکانی خوا چی یە لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٥٣: نمونەی ناوە ڕێك و پێك و بەناوەڕۆکەکانی خوا ( أسماء الله الحسنى ) لە قورئاندا کامەیە ؟

پ٥٤: نمونەی ناوە ڕێك و بە ناوەڕۆکەکانی خوا چی یە لە سوننەتدا ؟

پ٥٥: نمونەی ناوە ڕێك و بە ناوەڕۆکەکانی خوا بەڵگە یە لە سەر چەند شت ؟

پ٥٦: نمونە لەسەر ئەو بابەتەی سەرەوە چی یە ؟

پ٥٧: ناوەکانی خوا چەند بەش دەگرێتە خۆی ؟

پ٥٨: ناوەکانی خوا دەکرێت بە چند بەشەوە لە ڕووی ناو هێنا نمان بۆ خوا ؟

پ٥٩: نمونەی سیفەتی خۆیی یەکان ( ذات ) لە قورئاندا چی یە ؟

پ٦٠: ئایا لە سوننەتدا نمونەمان هەیە سەبارەت بەسیفەتە خۆییەکان ؟

پ٦١: نمونەی سیفەتە کارییەکان ( ألأفعال ) ی خوا چی یە لە قورئاندا

پ٦٢: نمونەی سیفەتە کارییەکانی خوا کامەیە لە سوننەتدا ؟

پ٦٣: ئایا لە سیفەتە کارییەکانی خوادا دەتوانرێت ناو دەربهێنرێت یان هەموو ناوەکانی خوا وەستێنراوە ( توقیفی ) ؟

پ٦٤: ناوی خوا ( العلي الأعلى ) چی دەگەیەنێت ؟

پ٦٥: بەڵگەی بەرزی شوێنی خوا چی یە لە قورئاندا ؟

پ٦٦: ئایا بەرزی شوێنی خوا بەڵگەی لەسەرە لە سوننەتدا ؟

پ٦٧: ئایا پێشەوایانی ئیسلام لە پێشینە صالحەکان سەبارەت بە ( استواء ) چیان فەرموو ؟

پ ٦٨: بەڵگەی بەرزی خوا و زاڵ بوونی لە قورئاندا چی یە ؟

پ٦٩: بەڵگەی بەرزی خواو زاڵبوونی لە سوننەتدا چی یە ؟

پ٧٠: بەڵگە چییە لەسەر گەورەیی و باڵا دەستی خوای گەورە ( علو الشأن ) و ئەو سیفەتانە چین کە نابێت بدرێتە پاڵ خوای گەورە ؟

پ٧١: مەبەست لەو فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) چی یە دەربارەی ناوەکانی خوای گەورە کە هەرکەس بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە ؟

پ٧٢: چ شتێك پێچەوانەی یەکتاپەرستی ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوایە ؟

پ٧٣: ئایا هەموو جۆرەکانی یەکتاپەرستی پەیوەستن بەیەکەوە بڕوا نەبوون بە جۆرێکیان ئەوانیتر هەڵدەوەشێنێتەوە ؟

پ٧٤: بەڵگە چی یە لەسەر بڕواهێنان بە فریشتەکان لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ٧٥: مانای ئیمان هێنان بە فریشتە چی یە ؟

پ٧٦: چەند نمونەیەك لەو فریشتانە باس بکە بە پێی کارەکانیان ؟

پ٧٧: بەڵگەی ئیمان هێنان بە کتێبە ئاسمانی یەکان چی یە ؟

پ٧٨: ئایا هەموو کتێبە ئاسمانیەکان ناویان هاتووە لە قورئاندا ؟

پ٧٩: مانای بڕواهێنان بەکتێبەکانی خوای گەورە چی یە ؟

پ٨٠: پلەو پایەی قورئان چۆنە لەچاو کتێبەکانی تردا ؟

پ٨١: ئەرکی ئیمانداران بەرامبەر قورئان چی یە ؟

پ٨٢: مەبەست لە دەسگرتن بە قورئان و هەستان بە حەق دانی قورئان چی یە ؟

پ٨٣: حوکمی ئەو کەسە چی یە کەبڕوای بە دروستکراوی قورئان هەبێت ؟

پ ٨٤: ئایا سیفەتی قسەکردن ( خۆیی یە نایگرێتەوە ) خۆیی یان کرداریە ؟

پ٨٥: وەستاوەکان ( الواقفە ) کێن و حوکمیان چی یە ؟

پ٨٦: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە بڵێت خوێندنەوەی قورئان دروست کراوە ؟

پ٨٧: بەڵگەی ئیمان هێنان بە پێغەمبەران چی یە ؟

پ٨٨: مانای بڕواهێنان بە پێغەمبەران چی یە ؟

پ٨٩: ئایا بانگەوازی پێغەمبەران هەموویان یەك بانگەواز بوون ؟

پ٩٠: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی بانگەوازی پێغەمبەران یەك بووە لە سەرچاوەی خوا پەرستیدا ؟

پ٩١:بەڵگە چی یە لەسەر جیاوازی بەرنامەی پێغەمبەران لەمەسەلە فەرعیەکاندا؟

پ٩٢: ئایا خوای گەورە لە قورئاندا چیرۆکی هەموو پێغەمبەرانی بۆ باس کردووین؟

پ٩٣: ناوی چەند پێغەمبەر هات لە قورئاندا ؟

پ٩٤: ( ألواالعزم )لە پێغەمبەراندا کامانەن ؟

پ٩٥: یەکەم پێغەمبەر کێ بوو ؟

پ٩٦: ئیختلاف چ کاتێك ڕویداوە ؟

پ٩٧: کێ کۆتا پێغەمبەرە ؟

پ٩٨: بەڵگە چی یە لەسەر ئەوەی کە محمد کۆتا پێغەمبەرە (ﷺ) ؟

پ٩٩: ( محمد ) بەچ شتێك تایبەت مەندبووە بەسەر پێغەمبەرانی تردا ؟

پ١٠٠: موعجیزەی پێغەمبەران چی یە ؟

پ١٠١: بەڵگەی معجیزە بوونی قورئان چی یە ؟

پ١٠٢: بەڵگەی ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی چی یە ؟

پ١٠٣: مەبەست لە ئیمان هێنان بە ڕۆژی دوایی چی یە و چی دەگرێتەوە ؟

پ١٠٤: ئایا کەس دەزانێت قیامەت کەی ڕوودەدات ؟

پ١٠٥: نمونە نیشانەکانی قیامەت لە قورئاندا کامەیە ؟

پ١٠٦: نمونەی نیشانەکانی قیامەت لە سوننەتدا کامەیە ؟

پ١٠٧: بەڵگە چی یە لەسەر بڕواهێنان بە مردن ؟

پ١٠٨: بەڵگە چی یە لە قورئاندا لەسەر سزای قەبر و بوونی خۆشی و ناخۆشی لەقەبردا ؟

پ١٠٩: بەڵگەی بوونی سزای قەبر وە بوونی خۆشی و ناخۆشی لە سوننەتدا چی یە ؟

پ١٣٢: بەلگەی مانەوەی بەهەشت و دۆزەخ چی یە بە بەردەوامی ؟

پ١٣٣: بەلگە چی یە لەسەر ئەوەی کە خوا لە ڕۆژی دوایی دەبینرێت لەلایەن ئیمانداراناەوە ؟

پ١٣٤: بەلگە چی یە لەسەر باوەڕهێنان بە شەفاعەتو کێ شەفاعەت دەکات و بۆ کێ یە و کەی دەبێت ؟

پ١٣٥: چەند جۆر شەفاعەت هەیەو کامیان گەورە ترە ؟

پ١٣٦: ئایا کەس دەچێتە بەهەشت یان ڕزگاری دەبێت لە دۆزەخ بە کردەوەی خۆی ؟

پ١٣٨: بەلگە چی یە لەسەر بڕوا هێنان بەقەدەر ؟

پ١٣٩: پلەکانی بڕواهێنان بە قەدەر چەندن ؟

پ١٤٠: بەلگە چی یە لەسەر باوەڕهێنان بە پلەی یەکەمی قەدەر کە ئەویش زانستە؟

پ١٤١: بەلگە چی یە لەسەر بڕواهێنان بە پلەی دووهەمی قەدەر کە ئەویش نووسینی ئەو شتانەیە کە ڕوودەدات ؟

پ١٤٢: پلەکانی زانستی خوا چی دەگرێتەوە لەوەی کە نوسراوە ؟

پ١٤٣: بەلگە چی یە لەسەر تەقدیری ئەزەلی ؟

پ١٤٤: بەلگەی ڕێژەی تەمەن چی یە لە ڕۆژی پەیمان وەرگرتن ؟

پ١٤٥: بەلگە چی یە لەسەر دانان و نوسینی ڕێژەی تەمەن لەگەلْ دروست بوونی تۆو لە ڕەحمی دایکدا ؟

پ١٤٦: بەلگە چی یە لەسەر ڕێژەی سالانە لە شەوی قەدردا ؟

پ ١٤٧: بەلگە دانانی ڕێژەی ڕۆژانە چی یە ؟

پ١٤٨: دانانی ڕێژەو کارەکان لەوەو پێش چ پەیوەندیەکی بەختەوەری و بەد بەختی یەوە هەیە ؟

پ١٤٩: بەڵگە چی یە لەسەر پلەی سێیەمی بڕوا بە قەدەر ئەویش بڕواهێنانە بە وویستی خوا ؟

پ١٥٠: خوای گەورە موسڵمانی خۆش دەوێت و ڕقی لە ستەم کارانە ، ڕازیە لە ئیمانداران و نا ڕازیە لە بێ باوەڕان وە خراپەی پێ ناخۆشە ، ئەمە چۆن دەگونجێت لەگەڵ ویستی خوادا چونکە هیچ شتێك نابێت و نایەتەدی ئەگەر خوا نەیەوێت و ئایا ڕقی لە شتێکە و حەزی لێ ناکات بەڵام مۆڵەت دەدات ببێت ؟

پ١٥١: بەڵگە چی یە لەسەر چوارەم پلەی بڕواهێنان بە قەدەر کە ئەویش پلەی دروست کردنە ؟

پ١٥٢: ئەم فەرموودەیە مانای چی یە ( والخير كله في يديك و الشر ليس اليك ) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتەوە : لەگەڵ ئەوەشدا کە خوا خولقێنەری هەموو شتێکە ؟

پ١٥٣: ئایا بەندەکان ئەو کارانەی کە ئەنجامی دەدەن هیچ وویست و دەسەڵاتێکیان تێدا هەیە ؟

پ١٥٤: ئایا بۆ خوا هەموو بەندەکانی ناکاتە موسڵمانی گوێ ڕایەڵ لە کاتێکدا دەستەڵاتی بەسەر ئەوددا هەیە ؟

پ١٥٥: پلەو پایەی ئیمان بەقەدەر چۆنە لە ئیسلامدا ؟

پ١٥٦: پلەکانی ئیمان چەندن ؟

پ١٥٧: زانایان چۆن تەفسیری ئەو پلانەیان کردووە ؟

پ١٥٨: بە کورتی ئەوەی زانایان لەسەر پلەکانی ئیمان باسیان کردووە چی یە ؟

پ١٥٩: بەڵگەی چاکە کردن ( الأحسان ) چی یە لە قورئان و سوننەتدا ؟

پ١٦٠: چاکە کردن لە خوا پەرستی دا چی یە ؟

پ١٦١: چ شتێك دژی ئیمانە ؟

پ١٦٢: ڕوونی بکەرەوە چۆن کوفری بڕواداری پێچەوانەی تەواوی ئیمانە و باس لەوە بکە چۆن کۆفر دەبێتە هۆی نەهێشتنی ئیمان ؟

پ١٦٣: چەند جۆر کوفری گەورە هەیە کە دەبێتە هۆی دەرچوونی خاوەنەکەی لە ئیسلام ؟

پ١٦٤: کوفری نەزانین و بە درۆ خستنەوە چی یە ؟

پ١٦٥: کوفری بێ بڕوایی ( الجحود ) چی یە ؟

پ١٦٦: کوفری عیناد و لووت بەرزی چی یە ؟

پ١٦٧: کوفری دوو ڕوویی چی یە ؟

پ١٦٨: کوفری کرداری کامەیە کە مرۆڤ لە دین دەرناکات ؟

پ١٦٩: ئەگەر ووتیان کڕنوش بردن بۆ بت و سوکایەتی کردن بە قورئان و جنێو دان بە پێغەمبەر و گاڵتە کردن بە دین و ئەو شتانە ، هەمووی کوفری کردارین وەك دەردەکەوێت ، ئەی بۆچی مرۆڤ لە دین دەردەکەن لە کاتێکدا کوفری بچوك بە کوفری کرداریی پێناسە دەکرێت ؟

پ١٧٠: ستەم و لە فەرمانی خوا دەرچوون و ( الفسوق ) دووڕوویی ئەکرێن بە چەند بەشەوە ؟

پ١٧١: نموونەی ستەمی گەورەو بچوك چی یە ؟

پ١٧٢: نموونەی لەفەرمان دەرچوون ( الفسوق ) ی گەورەو بچوك چی یە ؟

پ١٧٣: نموونەی دووڕوویی گەورە و بچوك کامەیە ؟

پ١٧٤: حوکمی جادوو جادوگەر چی یە ؟

پ١٧٥: سزای شەرعی جادووگەر چی یە ؟

پ١٧٦: هەڵوەشاندنەوە چی یە و حوکمی لە شەرعدا چۆنە ؟

پ١٧٧: نوشتەی شەرعی چی یە ؟

پ١٧٨: نوشتەی قەدەغەکراو کامەیە ؟

پ١٧٩: حوکمی ئەو شتانە چی یە کە دەکرێن بەسەر شانی منداڵ و نەخۆش و ...هتد ، یان ئەو بازن و پەت و مورووانەی بەکاردێن ؟

پ١٨٠: حوکمی هەڵواسینی هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان چی یە ؟

پ١٨١: حوکمی فاڵچی ( کهان ) چی یە ؟

پ١٨٢: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە قسەی فاڵچی بەڕاست دەزانێت ؟

پ١٨٣: حوکمی ئەستێرناسی گەری چی یە ؟

پ١٨٤: حوکمی داوا کردنی باران بە بورج و ئەستێرەکان چی یە ؟

پ١٨٥: بەیدووم ( الطیرة ) حوکمی چی یە و بە هۆی چی یەوە نامێنێ ؟

پ١٨٦: حوکمی چاو پیسی لە شەرعدا چۆنە ؟

پ١٨٧: گوناهو تاوان دەکرێن بە چەند بەشەوە ؟

پ١٨٨: مرۆڤ چۆن لە تاوانەکان خۆی پاك دەکاتەوە ؟

پ١٨٩: گوناهە گەورەکان کامانەن ؟

پ١٩٠: گوناهی گەورە و خراپەی بچوك بەچی دەسڕێتەوە ؟

پ١٩١ ( التوبة النصوح ) گەڕانەوەی ساغ چی یە ؟

پ١٩٢: چ کاتێك تەوبە کردن وەرناگیرێت لە تاکەکان و بوار نامێنێت بۆ گەڕانەوە و تەوبە کردنی بەندەکان بۆ لای خوا ؟

پ١٩٣: چ کاتێك بوار نامێنێت بۆ تەوبە کردن لە ژیانی دونیادا ؟

پ١٩٤: حوکمی ئەو کەسە چی یە کە یەکتا پەرستە بەلام سوورە لەسەر کردنی گوناهێکی گەورە ؟

پ١٩٥: ئایا سزاکان دەبنە کەفارەتی گوناهی خاوەنەکانیان ؟

پ١٩٦: چۆن ئەم فەرموودەیە ( فهو الى الله أن شاء عفا عنه وأن شاء عاقبه ) یەك دەگرنەوە لەگەڵ ئەوەی لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد کە هەرکەس خراپەکانی زۆر تر بێت لە چاکەکانی دەچێتە دۆزەخەوە ؟

پ١٩٧: ئایا ئەو ڕێگە ڕاستە کامەیە کە خوای گەورە فەرمانی کردووە پابەندین پێوەی و شوێن ڕێبازی تر نەکەوین ؟

پ١٩٨: مرۆڤ چۆن دەتوانێت خۆ بپارێزێت لە لادان و چەواشە بوون ؟

پ١٩٩: ئایا چ شتێك پێچەوانەو دژی سووننەتە ؟

پ٢٠٠: بیدعەت دەکرێت بەچەند بەشەوە لە ڕووی زیان گەیاندنی بە دینەوە ؟

پ٢٠١: ئەو بیدعانە چین کە خاوەنەکەی لە دین دەردەکات ؟

پ٢٠٢: ئەو بیدعانە چین خاوەنەکانیان لە دین دەرناکەن ؟

پ٢٠٣: بیدعە دەکرێت بە چەند جۆرەوە لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە ؟

پ٢٠٤: بیدعەی خوا پەرستی دەکرێت بە چەند جۆرەوە

پ٢٠٥: چەند حاڵەتی بیدعەمان هەیە لە خوا پەرستیدا ؟

پ٢٠٦: بیدعەی مامەڵە چی یە ؟

پ٢٠٧: چ شتێك لەسەر موسڵمانان پێویستە بیکەن بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و خانەوادەی پێغەمبەر (ﷺ) ؟

پ٢٠٨: چاکترین هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کێ یە بە شێوەیەکی گشتی ؟

پ٢٠٩: چاکترین هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کێ یە بە شێوەیەکی تایبەت ؟

پ٢١٠: پاش پێغەمبەر (ﷺ) ماوەی خەلیفایەتی چەندە ؟

پ٢١١: بەڵگەی خەلیفایەتی هەر چوار خەلیفەکە بە کورتی چی یە ؟

پ٢١٢: بەڵگەی خەلیفایەتی ئەو سێ هاوەڵەی پێغەمبەر (ﷺ) چی یە بە شێوەیەکی کورت ؟

پ٢١٣: بەڵگەی خەلیفایەتی ئەبوبەکر و عومەر بە شێوەیەکی کورت چی یە ؟

پ٢١٤: بەڵگە چی یە لەسەر شایستەی ئەبوبەکر بۆ خەلیفایەتی و دانانی بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ) ؟

پ٢١٥: بەڵگە چی یە لەسەر شایستەی عومەری کوڕی خەتاب بۆ خەلیفایەتی پاش ئەبوبەکر ؟

پ٢١٦: بەڵگە چی یە لەسەر شایستەیی عوسمانی کوڕی عەففان بۆ خەلیفایەتی پاش ئەبوبەکر و عومەر ؟

پ٢١٧: بەڵگەی شایستەیی علی کوڕی ئەبو تالیب چی یە لەسەر خەلیفایەتی پاش عوسمانی کوڕی عەففان؟

پ٢١٨: واجبی سەرشانی موسڵمانان بەرامبەر بە ئەمیرەکانیان چی یە ؟

پ٢١٩: بەڵگەی ئەوەی لەسەردوە باسمان کرد چی یە ؟

پ٢٢٠: فەرماندان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە بەرامبەر کێ واجبە و چەند پلەی هەیە ؟

پ٢٢١: حوکمی کەرامەتی وەلی یەکان ( دۆستەکان )ی خوا چی یە؟

پ٢٢٢: وەلیخوا کێ یە؟

پ٢٢٣: ئەو تاقمە کێن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا باسی کردوون ( لا تزال طائفة من أمتي على الحق ظاهرة لا يضرهم من خالفهم حتى يأتي امر الله تبارك و تعالى ) ئیمام بوخاری و موسلیم و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە.

واتە: (بە بەردەوامیی تاقمێك هەن لە ئوممەتەکەم کە لەسەر هەقن وە بە هۆی بەرگری کردنیان لەو حەقە سەرکەوتوو دەبن زیانیان پێ ناگەیەنێت، قسە و کرداری ئەوانەی بیر و ڕایان پێچەوانەی ئەوانەیە تا فەرمانی خوای گەورە خۆی دێت بە کۆتایی هاتنی ژیانی دونیا ).